بسم الله الرحمن الرحيم




✿ ناوی کتێب: ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لەئیسلامدا

✿ نووسینی: محمد فتح الله گولەن

✿ وەرگێڕان بۆ عەرەبی: إحسان قاسم صالحی

✿ وەرگێڕان بۆ کوردی: ڕۆوف مەعروف

✿ تیراژ: (٣٠٠٠) دانە

✿ چاپی یەکەم ٢٠١١

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٦١٠)ی ساڵی ٢٠١١ ی پێ دراوە

# ڕۆح و حەقیقەتی
# جیهاد لە ئیسلامدا


نووسینی

**محمد فتح الله گولەن**

وەرگێڕان بۆ عەرەبی

**إحسان قاسم الصالحی**

وەرگێڕان بۆ کوردی

**ڕؤوف مەعروف**



چاپی یەکەم

١٤٣٢ك - ٢٠١١ز

# پێشەکی

الحمد لله رب العلمين، والصلاه والسلام على خيرالمرسلين محمد و على اله وصحبه أجمعين الى يوم الدين.

زۆر دەمێکە چەمکی جیهاد لە ناو کۆمەڵگەی ئێمەدا ستەمی لێ دەکرێت و لەشوێن و جێیەك بەکار دەهێنرێت کە شیاوی ئەو وشە پیرۆزە نی یە، ئەمەش زیادە رەوی و کەم رەوی (الأفراط والتفريط) بەرهەم دێنێت یاخود ماناو لێکدانەوەی جۆراو جۆری بۆ دەکرێت کە لەگەڵ ناوەرۆکی ئەو چەمکە یەکناگرنەوە، هەر لەو ساتە وەختەی کە جیهانی ئیسلامی سەردار و خەلیفەی خۆی لەدەست دا و، بەیداخی شەکاوەی جیهاد لە جیهانی گەورەی ئیسلامدا داگیراو، فەزڵی ژیانی دنیای فانی درا بەسەر بەختەوەری هەمیشەیی دوارۆژدا، رۆڵەکانی ئەم ئوممەتە لە ناو خۆشی و چێژەکانی دنیادا نوقم کران و هیممەتی بەرزیان نەماو هەموو ئاوات و خەمێکیان قەتیس بوو لە دەسکەوتنی هەندێك (نەك هەموو) شمەکی کەم و بێبایەخی دنیاو حەزی پاڵدانەوە و حەوانەوەدا... هێدی هێدی هیوا درێژی سەری تێکردین و باڵی کێشا بەسەرماندا، رقمان لە مردن بوویەوە، ئەو مردنەی کە باوباپیرانمان بە پەرۆشەوە بەرەو پیری دەچوون!...بەمەش لەگەڵ زۆری ژمارەمان بووینە پاروویەکی چەور بۆ دوژمنە سەر سەخت و داخ لەدڵەکانمان.

ئەو دوژمنانەی کە جاران لە بارەی باوباپیرانی ئێمەوە دەیانگوت: ناتوانین لەگەڵ گەلێك بجەنگین کە حەزیان لـە مردنـە، وەك چۆن ئێمـە حەزمان لە ژیانە!... ئەوان هاتن توێژینـەوەی چـڕو پـڕ و هەمـەجۆریان لەسەر ئێمە ئەنجامدا تا گەیشـتنە ئـەو دەرەنجامـەی "کاتێك دەتـوانن بەسەرماندا زاڵ بن کە وەك خۆیان عاشق و شەیدای ئەم ژیانـە فانیـەی دنیا بین" ئەوکاتە نەزانی و پەرتەوازەیی وهەژاریەمان نەبێت هیچ شتێك نابێت لەوانمان جویێ بکاتەوە کـە زۆرێـك لـەم دەردو بەڵایانـەش دیـاری دەستی ئەوانن بۆ ئێمەی ژێر دەستەو شوێن کەوتەی ئەوان!!

ئەم کتێبـەی بەردەسـتی خوێنـەریش دیاریـەکی بـەنرخی بیریـاری ئیسلامیی مەزن مامۆستا (محمـد فـتح الله گولـەن)ە کـە کتێبـەکانی بـۆ زۆرێـك لـە زمانـە زینـدوەکانی جیهـان وەرگێـڕراون و چـەندین پێگـەی ئەلیکترۆنی کە لە ٢٠ پێگە زیاترن بە زمانە جۆراو جۆرەکانی دنیـا بـیرو بۆچـونەکانی پـەخش دەکـەن، ئێمـەش شـادومانین کـە گـەلی کـوردی هۆشیار کە لەوەتی ئەم ئاینە شیرینەی لە ئـامیزگرتووە دەسپێشـخەری کـردووە و زۆریێ لـە سوارچـاك و سـەرکردە و زانـای بلیمـەتی لـە گشـت مەیدانەکانـدا پێشـکەش بـەم ئاییـنە کـردووە، هیـوادارین لـەم بیریـار و پێشـەوا مەزنـە جیهانیـەش بـەهرەوەر بێـت و لـە میللـەتانی تـر دوا نەکەویێ... ئێمەش وێڕای ئەوەی کە دان بـە کۆڵـەواری و دەستەوسـانی خۆماندا دەنێین هەستاوین بە وەرگێڕانـی ئـەم بەرهەمـەی مامۆسـتا بـۆ زمانی شیرینی کـوردی و هـەوڵی زۆرمـان داوە کـە پارێزگـاری لـە مانـاو

ناوەڕۆکی بکەین و بە ئەمانەتەوە بیگەێنینە خوێنەرانی ئازیز. جا ئەگەر هەر کەم و کوڕیەك هەبێ ئەوە لە ئێمەوە و هەر چاکەیەکیش هەبێ لە خوای گەورەوەیە.

ماوەتەوە بڵێین زۆر سوپاس و پێزانینی خۆمان ئاراستەی ئەو براو مامۆستایانەمان دەکەین کە لەگەڵ ئەم بەرهەمەدا ماندوبوون و شەونخونیان کێشاوە، یاخود کاری چاپ و بڵاوکردنەوەیان گرتە ئەستۆ و، ماندونەناسانەو بەکردەیی مانای جیهادیان نیشاندایـن، لەخوای باڵادەست داواکارین کەماندوبوونیان قبوڵ بفەرموێو لە تای تەرازوی حەسەناتیاندا تۆماری بکات و ئەم هەژارەش لە ئیخلاس و نیەتی پاك بێبەش نەکات ..آمین.

**تێبینی:**

* واتای ئایەتە پیرۆزەکانمان لە خولاسەی تەفسیری نامی وەرگرتووە و ڕاستەوخۆ دوای ئایەتەکە بە دوو کەوانە () جیادەکرێتەوە لە نوسینی مامۆستا، بەڵام تەنها لەو شوێنانەدا کە پێویست بووبێت و، مامۆستا فتح الله خۆی تەفسیری ئایەتەکەی نەکردبێت.

* واتای فەرمودە پیرۆزەکانیش بە هەمان شێوەی ئایەتەکان بە دوو کەوانە () جیادەکرێتەوە لە نوسین و ڕاڤەی مامۆستا بۆ فەرمودەکان.

وەرگێڕی کوردی

## پێشکەش :

ئیسلام یاسایەکی خودایی گشتیە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان، بە پرۆگرامی هەمەجۆر و تایبەت بە هەریەك لەو بوارانە گشت مرۆڤایەتی و هەموو دنیا و ئاخیرەتیش لەئامێز دەگرێت. گرنگترین ئامانجی بریتی یە لە بەرزکردنەوەی مرۆڤ بۆ چڵەپۆپەی مرۆڤایەتی و، کردنی بە مرۆڤێکی کامڵ لە جوانترین شێوەدا. گەر وێنای کۆمەڵگەیەکمان کرد کە تاکەکانی کامڵ بن، ئەو ئوممەتەی کە لەم جۆرە کەسانە پێك هاتبێ، دەگەنە پلە و پایەیەکی کەماڵی وا کە تەواوی مەلائیکەتەکانی ئاسمان بەو ئاستە نەگەن، چونکە ئەوان هێشتا لە دنیادان تام و چێژی ژیانی بەختەوەری بەهەشت دەنۆشن .. ئەگەرێ هەندێك لە توێژەکانی کۆمەڵگە بەختەوەرەکان هەر لە چاکترین سەدەوە تا دەگاتە ئەمڕۆمان وەکو نمونەیەك ببینرێن و شوێن پێیان هەڵبگیرێت.

بەڵام ئەگەر حاڵی ئێستامان بکەینە بناغەی لێکۆڵینەوەکەمان ڕوو بە ڕووی ئەم ڕاستیە دەبینەوە: ئەوانەی وەك نوێنەر و بڵاوکەرەوەی ئیسلام دەردەکەون، بە تەواوی لە ئیسلام تێنەگەیشتون و وەك پێویستیش نەیانتوانیوە بیگەیەنن و تەبلیغی بۆ بکەن. هەروەها لە ڕۆشنایی ئەوەی لە سەرەوە باسکرا ناشتوانن لە ژیانی ڕۆژانەیاندا پیادەی بکەن. دیارە ئەنجامی سروشتی ئەمەش هەرچەندە ئیسلام ئەو

ئاینەیە کە خوای جیهانیان پێی ڕازیە، بەڵام خەڵکی تر لە هەمان ڕوانگەوە سەیری ناکەن.

هەر لە سەدەی یەکەمەوە تاکو ئێستاش چەندین خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە دەکرێن دەربارەی هەندێك لە مانا و ئەحکام و بەرنامە جۆرا و جۆرەکانی ئیسلام، ئەویش بە پوخت کردن و بژارکردنی ئەو چەمکانە، بگرە بە لێکۆڵینەوە و دادگایی کردنی، ئیدی ئەمە لە ئاستی زانایاندا بێت یاخود عەوامدا. یەکێك لەو چەمکانەش بریتییە: لە چەمکی(جیهاد) .

یەکێك لە واتاکانی جیهاد بریتییە: لە هەوڵ و کۆشش و بەرخۆدان. بەپێی ئەم واتایە موسوڵمانان بە پیاو و ژن و پیر و لاوەوە جیهادیان لە ئەستۆدایە. شێوازی جیهادیش بە گوێرەی هەل و مەرج و خواست و پێویستیەکانی دەگۆڕێت، بەوەی کە لە شوێنێکدا (فەرزە) و لە شوێنێکی تر (واجبە) و لە لایەکی تر (موباحە).

هەروەك لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە جیهاد دوو جۆرە: یەکێکیان ئەو جیهادەیە کە مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا ئەنجامی دەدات، کە جیهادی گەورەی (الجهاد الاكبر)ی پێدەوترێت. ئەوی تریان جیهادی دوژمنانەو، جیهادی بچووکی (الجهاد االأصغر)ی پێ دەوترێت، ئەم جۆرەیان "جیهادی بچووك" هەر لە مێژە لە ئاستی فیکردا جێی باس و خواسە. واتە ئەم دەستور و یاسایەی کە بڕیاری داوە مرۆڤ بڵند بکات و بیگەیەنێتە چڵە پۆپەی کەماڵ و تەواوی، چۆن ڕێگە دەدات ئەوەی

ئیمانی بە ئیسلام  نییە بکوژرێت، هەروەها ژنان بەدیل بگرێن و وەچە و نەوەی مرۆڤ لە ناو ببات؟ لە هاوشێوەی ئەم ڕەخنانە ...

لە ڕاستیدا ئەگەر ئەوان ورد ببنەوەو بە ویژدانەوە سەیر بکەن و ڕوداوەکانی مێژوو بگەڕێن و بپشکنن، ئەو کاتە دەزانن ئەم ڕەخنانەیان چەندە ستەم کارانەیە، لە هەمان کاتدا لە ڕاستی تێدەگەنو دەزانن جیهاد ئەو یاساو دەستورەیە کە دەستی مرۆڤ دەگرێتو بەکورتترینو چاکترین ڕێگا دەیگەیەنێتە کەماڵی مرۆڤایەتی.

دەبێ ئەو ڕاستیەش بزانرێت کە ئیسلام هەر لە سەرهەڵدانیەوە تاوەکو ئێستاش لە بەربەرەکانێی دوژمنانیدایە، بگرە هەرکات پێویست بووبێت هەوڵ و جیهادی چەکداریش بەکار هاتووە و، لێرەو لەوێش کوژراو بکوژ هەبووە. چونکە لە کاتی بڵاوبونەوەی ئیسلامدا لە هەموو لایەکەوە شێوە ئابلۆقەیەك گەمارۆ درا بوو، بۆیە زۆر سروشتییە کە بجەنگێت بۆ ئەوەی ئەو گەمارۆیە لەسەر خۆی لابەرێت و، ناچار بوو کە بجەنگێت بۆ ئەوەی هەلی بۆ برەخسێت و گوزارشت لە خۆی بکات.

ئاینی ئیسلام لە سەدەی یەکەمدا لە لایەن جولەکە و گاور و بتپەرستەکانەوە گەمارۆ درا بوو، هەروەك لەبەردەم هەڕەشەی عەرەبە بتپەرستەکان و بێزەنتی و ساسانیەکاندا بوو.

دەمارگیری ئاینی(التعصب الديني) بەو جۆرەی لە ئێستادا هەیەو، دەرنەکەوتنی پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەکەی ناو جولەکە و گاورەکان

و، ترسان لەوەی دەستکەوتە مادیەکانیان لـەکیس بچـن و، هاوشـێوەی ئەم هۆکارانە .. فاکتەر بوون بۆ دوژمنایەتی کردنی ئاینی ئیسلام..

له لایەکی ترەوە هەڵوێستی ئەو کۆمەڵگایەش کە پێغەمبـەریﷺ تێدا لە دایك بووە و گەورە بووە، جۆرێـك نـەبوو ئـاواتی بـۆ بخـوازرێ . دەمارگیری هۆز و قەبیلە و، دەمارگیری کوێرانـەی بـیر و بۆچـونەکانیان با نـاڕەواش بـن و، بڕیـاری مەرجـدار و پێشـوەخت لەسـەر شـتەکان .. نزمـی ئاسـتی ژیـانی کۆمەڵایـەتی و .. هانـدانو پیلانـی جولەکـەو... سەرباری ئەو ئاستەنگانەی لە کاتی جێبەجێکردنی فەرمانە ئاینیەکانـدا دەهاتنە ڕێ و.. عەرەبە دەشتەکیەکانیش کـە بـەردەوام بەربـەرەکانێی ئیسـلامیان دەکـردو زەنگـی مەترسـیەکی شـاراوە بـوون بـۆ ئیسـلام.. هـەموو ئەمانـە وێنـای بەشـێکی کـەمی ئـەو دوژمنایەتیـە دەکـەن کـە گەمارۆی ئیسلامی دابوو و، زۆربـەی غـەزاکانی پێغەمبـەریشﷺ لەگـەڵ ئەم بت پـەرستانەدا بوو.

لــە لایــەکی تــرەوە لەگــەڵ زۆربــوونی پــەیڕەوانی ئیســلام و ســەقامگیربوونی ڕۆژ لــە دوای ڕۆژ و، بڵاوبوونــەوەی خێــرای لــە ســەر زەویـدا بەربـەرەکانێی بێزەنتـی و ساسـانیەکانیش دەسـتی پێکـرد. شتێکی سروشتیشە کە عەقڵیەتێك هەموو شـتێك بـە تێڕوانینـی دنیـایی وەربگرێـت و، سـودو دەسـکەوتە ماددیـەکان بکاتـە بنچـینە و پێـوەری هەموو شتێك لەم ژیانەی دنیادا دژایەتی ئیسلام بکـات، چـونکە ئیسـلام دنیای ئێستاو داهاتووی سەرەو نخوون دەکاتەوە.

موسڵمانەکان لە چاکترین سەردەمدا یان لە ساڵەکانی دواتریشدا کاتێك جیهادیان لەگەڵ دوژمناندا کردووە ستەم و دەست درێژیان نەکردۆتە سەر هیچ کەس.. نەوە و وەچەی مرۆڤیان قڕنەکردووە و لەناو نەبردووە.. شارو دێهاتیان نەسوتاندوە و وێرانیان نەکردون، جگە لە جەنگاوەرانیش کەسیان نەکوشتووە، دیارترین نمونە لەسەر ئەمە ژمارەی کوژراوانە لە هەردوولا لە ماوەی بیست و سێ ساڵی ژیانی پڕ لە جیهادی پێغەمبەردا ﷺ، هەروەك مامۆستا محەممەد حەمیدوالله لەکتێبەکەیدا (غزوات الرسول ﷺ) ئاماژەی پێکردوە، کە لە چوارسەد کەس تێپەڕی نەکردوە. دەشتوانین نمونەی زۆر بێنینەوە، بگرە لە سەردەمی تورکەکانیشدا کە نۆ سەدەی بەردەوام حوکمیان کرد، چ جای لە چاکترین سەردەم و چەرخەکاندا.

بەڵێ، بێگومان ئیسلام ڕێگەی داوە بە جیهادی چەکداری، بەلاّم بۆ ئەمەش هەندێ مەرجی بۆداناوە لەوانە:

أ- بەرگری کردن لە موسڵمانان، لە ئایین و ژیانیان، لە ماڵ و منداڵ و وەچەو نەوەکانیان.

ب- پارێزگاری لە ئازادی بیر و بۆچون.

ج- پابەندبوون بە بەڵێن و بەڵگەنامەوە.

د- بۆ ئەوەی موسوڵمانانو ئەوانەش کە (ئەهلی ذیمە)ن و لە ئەستۆیاندان ستەمیان لێ نەکرێت.

لەســـەروی هـــەموو ئەمانـــەوە قورئـــانی پـــیرۆز ڕاشـــكاوانە و لـــە نالـەبارترین بارودۆخـدا فەرمویـەتی: ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾الأنفال: ٦١، واتـە: (ئەگـەر دوژمنـەكان مـەیلی ڕێكەوتن و ئاشتیان كرد تۆیش مەیلی بكەو بچۆ بە دەمیانەوە و، پشـت بە گەورەیی و دەستەڵاتی خودا ببەستە و لە فڕو فێڵی دوژمن مەترسە، خـــوداش شـــــنەواو زانایـــــە). ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱدْخُلُوا۟ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾﴾البقــرة: ٢٠٨، واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ملكەچ بـن بـۆ ئـاینی ئیسـلام لەهەموو ڕوویەكەوە و لە هەموو كـارو بـاردا. دوای شـتی تـر مەكـەون و ئـەحكامی قورئـان لەگـەڵ ئـەحكامی تـەورات تێكـەڵ مەكـەن و دوای هەنگاوی شەیتان مەكەون، شەیتان دوژمنی ئاشكراو ناحـەزی ئێوەیـە). لە چوار چێوە و مەرجی دیاریی كراودا ڕێ بە جەنگ دەدرێت بۆ ئەوەی ببێتە هۆكارێك بۆ ئاسایشی جیهان.

بەڵام بـە داخـەوە ئێمـە نـەمانتوانی بەچـاكی ئـەم ڕاسـتیە ڕوون و ئاشـكرایانە بـە خـەڵك بگەیـەنین. ئەوحەقیقەتانـەی بەشـێوەی تیـۆری (نظري) باسمان كردن، هەر ئەو ڕوداوانـەن كـەماوەی چـواردە سـەدەیە دەیانگوزەرێنین و چونەتە ئەسـتۆی مێـژوو. خۆزگـە دەمـانتوانی وەكـو خۆیـان بـە زمـانی مێژوونوسـێكی بلیمـەت و بـە توانـا بـە شـێوازێكی زانستیانە ڕاڤەیان بكەین..بەڵام ئەیهوو.. لـە پێنـاو ڕوونكردنـەوەی ئـەو بابەتانـەی كـە باسمـان كـردن و ئەوانـەش بـاس نـەكراون ئـەرك و

بەرپرسیاریەکی گەورە دەکەوێتە سەر شانی بڕیارە موسوڵمانەکان.
هیواداریین ئەم کتێبەی بەر دەستتان "ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلامدا" کەلێنێکی ئەم بابەتە پڕ بکاتەوە.

"ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلامدا" بابەتێکی فراوانە و دەکرێ لە زۆر بواردا لێکۆڵینەوەی لە سەر بکرێت، هەروەك دانەر لە پێشەکیەکەیدا باسی دەکات ئەگەر بمانەوێت هەموو رەهەندەکانی وەربگرین و لێکۆڵینەوە و وردبینی تێدا بکەین پێویستمان بە چەندین بەرگ دەبێت، هەرچەند لەم بابەتەدا چەندین کتێبی دانراو و بابەتی وەرگێڕراو هەیە. هەر لەبەر ئەوەیە کتێبی "ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلامدا" لە چەند بوارێکی دیاریکراودا ئەم بابەتە لە خۆدەگرێت. مامۆستای بەڕێزمان لە "پێشەکی"یەکەدا ئەوەی دەرخستووە کە: "بناغە و بنچینە لە ئیسلامدا ئاشتییە نەك جەنگ، لە گوتەیەکدا ڕوونمان کردەوە ئەو هۆکارانەی جەنگ بەرپا دەکەن بەرگری کردنە، ڕوو بە ڕووبونەوەی ستەمە، کردنەوەی دەرگای سەربەستی ئیرشاد و تەبلیغە"

ئەم کتێبە لەگەڵ ئەو موسەڵمانانەدا دەدوێ کە فەرمانیان بە جیهاد کردن پێکراوە و، ئەم بەشانەی تیا دەبینین: ئەرکەکانی جیهاد، دەسکەوتەکانی جیهاد ، ڕێگرەکانی جیهاد و، عاشقانی جیهاد ئەوانەی بوونەتە نمونە و پێشەنگ بۆ نەوەی ئێستامان، پشتگیری ئەم

گوفتارەمان دەکەن. لەو باوەڕەدام کە خوێنەری بەڕێزیش خۆی ئەم قەناعەتەی لە لا دروست دەبێت.

"ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلامدا" شەش بەشە.

لە بەشی یەکەمدا: دوای لێکۆڵینەوەی پڕاوپڕ لە بەر ڕۆشنایی قورئان و سونەتدا چەمکی جیهاد شی دەکاتەوە و، هەریەکەیان لەو جێگایەدا دادەنێت کە بۆی شیاوبێت، لەراستیدا ئەم جۆرە کارە زۆر پێویستە، چونکە جاری وادەبێت ئەم دوو چەمکە بۆچونی زۆر لە یەکتر جیاواز هەڵدەگرن. لە کاتی جێبەجێ کردنیشدا دەبێتە هۆی هەڵخلیسکان. بۆ نمونە: ئەو وتەیەی دەڵێت: جیهاد تەنها جیهادی گەورەیە، ئەوانە وا لە جیهاد تێدەگەن تەنها هەوڵ و جیهادە لەگەڵ دەرونی مرۆڤ خۆیدا، ئیدی لایەنی بانگەوازیان لە جیهانی دەرەوەی خۆیاندا فەرامۆش کردووە و، چونەتە ناو خەڵوەتگەکانیان و خۆیان تەنها سەرقاڵی زیکری خوا کردووە. لە هەمان کاتدا خەڵکانی تر هەن تەنها جیهادی بچوکیان وەرگرتووە، ئیتر وا دەیبینن و دەژمێرن کە جیهاد تەنها جیهادە دژ بە دوژمن، بگرە وایان لێهاتوە کە گوێ نادەنە پەرستش و عیبادەتە فەرزەکان.

لەبەر ئەوەشە هەرچەندە لە بارەی ئەم دوو جیهادەوە (گەورەو بچووک) بدوێین، إنشا الله زیادەڕۆییمان نەکردوە، بۆئەوەی لەم ژیانەی ئێستاماندا جوان لێیان تێبگەین و وەریان بگرین و، بە پێی

پێوەرەکانی "خیر القرون" جێبەجێ بکرێن. لەوەش دەچێ ئەم باسانە گەورەترین پانتاییان لەم کتێبەدا پێ درابێت.

بەشی دووەمی ئەم کتێبە بریتیە لە (ئەرکەکانی جیهاد) لێکۆڵینەوەیەکی چڕ و پڕی لایەنە جۆرا و جۆرەکانی جیهادە لە ڕووە دنیاییەکەیەوە، بۆ نمونە لە بابەتی (جیهاد سەرچاوەی ژیانە) لە بارەی گرنگی جیهادەوە دەڵێ:

"ئێمە لەوکاتەی وازمان لە جیهاد هێناوە کاولکاری و جیاوازی لە ناوماندا سەری هەڵداوە و گەشەی سەندووە، ئەوەی لە ئێستادا دەیبینین لەو گروپ و پارچە پارچە بوون و وێرانکاریانە جگە لە بەروبومی تاڵ و زەققومی ئەو تۆوە جەهەنەمیانەی لەوکاتەدا وەشێنران و، بڵاوبونەوە و گەشەیان کرد هیچ شتێکی تر نیە. بە جیهاد نەبێ ڕزگار بوون لەم بارە نالەبارە مرێنەرە ئەستەمە. جیهاد بۆ کەسی ئیماندار بڵندترین مەبەست و بەرزترین نمونەی بالآیە کە گیانی خۆی لە پێناودا بەخت دەکات...".

لە بەشی سێیەمدا: پەیوەندی (جیهاد – ئیماندار – گەردون) دەری دەخات کە یەکێك لە هۆکارەکانی بەرپرسیاریەتی ئیماندار بە جیهادەوە فەرمانرەواییە لە زەویدا، کە لەسەر حەق و سەربەستی و دادوەری دامەزراوە، ئەم دادوەریەش لەسەر زەویدا بەرپرسیاریەکی تایبەت بە ئیمانداران دادەمەزرێنێت. یان بەشێوازێکی تر ئەم دادوەرییەی حەشاردراوە لە نەخشەی قەدەری خواوەندا لەسەر دەستی

ئیماندارانـدا نـەبێت نایەتـە دی، لەبـەر ئەمـە هـەموو ئیمانـدارێك دەبـێ بیروبـاوەڕی وابێـت ئـەم بەرپرسـیاریە خراوەتـە ئەسـتۆی و لەسـەری پێویستە جێ بەجێی بکات، واتە پێویستە بیر بکاتەوە و کاری بۆ بکات بۆ ئەوەی لە ژیانی واقعیدا بێتە دی. لـەم بەشـەدا جـەخت لەسـەر ئـەم چەمکە کراوەتەوە و گرێیداوە بە سەردەمی پێغەمبەرەوەﷺ، بەهێنانی دوو نمونـەی ئـەو سـەردەمەدا ئـەوانیش "ئەنەسـی کـوڕی نـەضـر" و "بەرائی کوڕی مالك"ن

لەو بەشەشدا: (جیهاد چی بەرهەم دێنێ) لەگەڵ دەستکەوتەکانی جیهاد و باسـی ئـەو لەناوبـەر و ترسـناکیانە دەکـات کـە بـە لـە ئەسـتۆ نەگرتنی ئەم بەرپرسیاریە دێنەدی. لەم بەشەدا –هەروەك لەبەشـەکانی تردا– ڕێنمایی کەسانێکە هەست بە گەورەیی ئەم بانگەوازە بۆ لای خوا دەکەن. گومانی تێدا نیە ئەم ڕێنماییانە ئەو پەڕی بایەخدارن بە تایبەت ئەگەر ئەو کاتەی ئەم وتانەی تێدا وتراوە و ئـەم لێکۆڵینەوانـە پێشـنیار کراون بەرچاو بگیرێن، کەساڵی ١٩٨٠ یە لەو کاتەدا کە تۆقانـدن وتـیرۆر دەستێکی باڵای هەبووە لە وڵاتدا.

بەڵێ لەو کاتەی ئیرهاب لەم پەڕ و ئەو پەڕی وڵاتدا بازبازێنی بوو، کانگـای ئاشـوب و پشـێوی لـە دەرەوە و نـاوەوەدا ئـاگری فیتنـەی هەڵدەگیرسـاند، دەیـەها گـەنج ڕۆژانـە دەکـوژران، باسـی ئاسـایش و ئاسودەیی – ئاسایشی دەرون و ماڵ و سامان– گاڵت–ە جاڕی بوو.

بازرگانی شکستی هێنا بوو، بگره وای لێهات له ترسی ڕووداوه چاوه‌ڕوان نه‌کراوه‌کان بازرگانه‌کان نه‌توانن به ئاسوده‌یی بچنه ناو کۆگاکانیان و ناچار بوون کۆگاکانیان دابخه‌ن. هه‌وڵ و جیهادی مامۆستامان بۆگه‌یاندنی ئه‌م ڕێنماییه به‌رز و بڵندانه و بڵاوکردنه‌وه‌یان، یاخود دروست کردنی ئومێد و هیوای پرشنگدار به تایبه‌تی له‌وکات و ساته‌دا و له‌سه‌ر سه‌کۆ و دوانگه‌ی ئامۆژگاری له مزگه‌وتی گه‌وره‌ی "بورنوا" له شاری ئه‌زمیر، ئه‌مه بێ له گوزارشی نیه‌ت پاکی بۆ سه‌قامگیری ئاسایش و یاسا و ئارامی ئه‌م وڵاته هیچی تر نی یه.

"بێگومان له‌م کاته‌دا هه‌ر جۆرێك له جۆره‌کانی تیرۆر و ئاژاوه سه‌رچاوه‌که‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ بێگانه و بیانیه‌کانن، ئه‌وان ده‌یانه‌وێ ئه‌م وڵاته‌ی که وه‌ك به‌هه‌شت وایه، بیکه‌نه دۆزه‌خێك و نه‌توانرێ ژیانی تیا به‌سه‌ر ببرێت. پاشان له‌وه ئاسانتر نیه وڵاتێك ناچار بکرێت به‌چۆکا بێت، که هێز و توانای له ئه‌نجامی ئیرهاب و ئاشوبه‌وه له‌ناو چوو بێت. ئه‌مه‌ش ئه‌و شته‌یه که بیانیه‌کان نه‌خشه‌ی بۆده‌کێشن و هه‌وڵی بۆ ده‌ده‌ن. ئه‌وان ده‌یانه‌وێ ئه‌م وڵاته ببێته ژێر ده‌سته‌یان و جێی ساغ کردنه‌وه‌ی کاڵا و واڵاکانیان و بۆ مه‌به‌ستی خۆیان به‌کاری بهێنن. ئیرهابی و ئاشوبگێڕه‌کان هه‌ر هه‌موویان به‌کرێگیراوی ئه‌و داگیرکه‌رانه‌ن. به‌ڵام به کۆمه‌کی خوا به مه‌به‌ستیان ناگه‌ن و فرۆفێڵه‌کانیان پوچه‌ڵ ده‌بنه‌وه و له‌ناوده‌چن. لێره‌دا کارێکی بایه‌خدار دێته ئاراوه ئه‌ویش ئه‌وه‌یه که سه‌رقاڵبوونمان به ئیرهابی و ئاشوب

گێڕانەوە لەو ئامانجەی دەمانەوێ دوامان دەخات. ئایا ئەمەش بە پلەی دووەم لەو شتانە نیە کە دوژمنانمان دەیانەوێ ؟ ئەوان دەترسن ڕۆژێ لە ڕۆژان موسڵمانان لەسەر پێی خۆیان راوەستن و خۆیانبگرن، ئیدی ئیرهابی وەك کەری هەڵاتوی لێدێت، کە دەیەوێت لە دەستی شێر خۆی قوتار کات.

لێرەدا شتێك هەیە پێویستە هەرگیز لە یادی نەکەین ئەویش ئەوەیە: ئەگەر پێویست بێت موسوڵمان بەرامبەر هەر جۆرێك لە جۆرەکانی دەست درێژی دەرەکی یان ناوخۆیی لەگەڵ هێزی سوپا یان ئاسایشی دەوڵەت بێت. ئەمە دەبێتە ئەرکی سەرشانی. ناکرێ واز لەم ئەرکەی بهێنێت. هەر ئەوەندە بەسە کە دەوڵەت بانگی بکات و وەها ئەرکێکی پێ بسپێرێت. بێگومان ئەم کارەی ئەنجامی دەدات تەواوکەری کاری دەوڵەتە، بە پێچەوانەی ئەوەش هەر جموجۆڵێکی تاکڕەوی سەردەکێشێ بۆ دروست بوونی توندوتیژیەکی تر. بۆیە پێویستە ئیمانداران وریابن و لەم کارەدا زۆر ئاگاداری خۆیان بن . چونکە ئیرهاب و پشێوی هیچ لایەنێکی شەرعی پاڵپشتیان ناکات و پێویستە لە ڕەگ و ڕیشە دەربهێنرێن."

ئەوەی سەرنج ڕاکێشە لێرەدا مامۆستامان فەرمودەیەکی پیرۆزی ڕوون کردوەتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی و ئەبوداود لە سونەنەکەیدا ڕیوایەتی کردووە، هەرچەندە ماوەی زیاتر لە چواردە سەدە بەسەر ئەم فەرموودەیەدا تێپەڕیوە چەندین وانەی گەورە و

دەرسی بە کەڵکی بۆ ئێمە تێدایە بەتایبەت بۆکاتی ئێستامان: (إذا تَبَايعتُم بِالعينَةِ وَأخَذْتمُ أذنابَ البَقَر وَرَضيتُم بالزَّرعِ وَتَركتُمُ الجيهاد سَلطَ الله عَليكُم ذلاً لايَنزعُهُ حَتّى تَرجِعُوا إلى دِينِكُم)[1].

بەشی پێنجەمی ئەم کتێبە (ئاستەنگەکانی جیهاد) تایبەتی کردووە بە هەندێك لایەنی لاواز تیاماندا، هەروەك لە ناونیشانی باسەکەدا دیارە. لێرەدا سەرنجت بۆ هەندێك بابەت و ڕوداو ڕادەکێشێت کە دەگونجێ بەسەر هەموو مرۆڤێکدا بێت، بۆ ئەمەش سروشتی مرۆڤی کردووە بە بناغە و ، باسی هەندێك لە هەڵدێران دەکات کە تایبەتە بە فیترەتی مرۆڤەوە. ئەو پێخلیسکانەی کە بێگومان دێنە دی، یاخود لەوانەیە بێنە دی، بۆ نمونە: حەزی "پاڵ دانەوە و پشودان". بەڕاستی ئەگەر سەرنج بدەین دەزانین سەرکردنە خۆشەویستی پاڵدانەوە و پشو لەم ژیانەی دنیادا، ڤایرۆسێکی ترسناکە و ڕۆحی جیهاد دەکوژێ و لە ناوی دەبات.

بێگومان دەکرێ مرۆڤ ئەم هەست و سۆزەی ئاڕاستە بکات لە ڕێگەی ڕەزامەندی پەروەردگار و ئەو بانگەوازە پیرۆزەی ئیمانی پێهێناوە، هەروەك بەم کارە دینەکەشی سەرکەوتودەبێت، لەم بەشەدا باس لەم دوو ئاستەنگە گرنگە کراوە لە گۆشەنیگای جۆرا و جۆرەوە نمونەی زۆری لە چاکترین سەردەم دا هێناوە بۆ تێپەڕاندنی

---

١- أبو دادو، البيوع، ٥٦ المسند للإمام أحمد ٤٢/٢.

ئاستەنگەکان، ، بەمەش ئاسۆی هیواکانی بۆ ڕووناك کردوینەتەوە و تین و توانا و عەزیمەتی بەهێز کردوین.

بەڵام بەشی کۆتایی (لە عاشقانی جیهاد)دا ئەویش پێشکەش کردنی نمونەی گەورە و خاوەن توانان کە خاوەنەکانیان تام و چێژی جیهادیان کردوە و لە هەموو کات و ساتەکانی ژیاندا لە شیلاوگەی ئەو شیرینیە نۆش دەکەن، کە ئەوانیش هاوەڵە بەڕێزەکانن، هێمای فەخر و شانازی و سەربەرزی کەرامەتمانن، لە ڕاستیدا دەکرێ باسی هەموو هاوەڵەکان لەم بەشەدا بکرێت، چونکە ئەم گەورە و سەردارانە هەموو ژیانیان لە پێناو ڕەزامەندی پەروەردگاریاندا بەسەر برد، بەڵام ئەمە کارێکە بێگومان لە تواناادا نیە لەم کتێبەدا ئەنجام بدرێت، هەر لەبەر ئەوەیە پاش ئەوەی شتێك لە جیهادی پێغەمبەری سەردارمانﷺ باس کردووە هەندێك لە هاوەڵە بەرێزەکان و هەڵوێستیان لە جیهاددا هەڵبژێراون.

کتێبی "ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلامدا" وەك هاو وێنەی کتێبەکانی (نوری جاویدان) و (قەدەر لە ڕوناکی قورئان و سوننەتدا)ی مامۆستامان(محەممەد فتح الله گولەن) بریتی یە لە کۆکردنەوەی ئەو وتارانەی لەسەر سەکۆی (وعظ)و ئامۆژگاری پێش ساڵەکانی ١٩٨٠ وتراون. ئەم کتێبە بەشێکە لەو ئامۆژگاریە یەك لە دوای یەکانەی مامۆستای بەڕێزمان، کە لە مزگەوتی گەورەی "بورنوا" ی سەر بە شاری ئەزمیر وتویەتیەوە کە لەو کاتەدا لەوێ ئامۆژگار (واعظ) بووە.

ئەم ئامۆژگاریانە سەرەتا لەسەر کاسێت تۆمار کراون دوایی کراون بە زمانی نوسین دوای ئەوەی لە لایەن خودی مامۆستاوە پاك نوسکراون و لە لاپەڕەی ئەکادیمی ڕۆژنامەی"زەمان"دا یەك لە دوای یەك بڵاوکراونەتەوە، کاتێکیش کران بە کتێب دوای تاتویێ کردنی سەرچاوەی ئایەتە پیرۆز و فەرموودە موبارەکەکان، دەقەکەیان بە عەرەبی نوسراوەتەوە. ئێستەش ئێوەو "ڕۆح و حەقیقەتی جیهاد لە ئیسلام"دا، لە هەمان کاتدا سوپاس و ستایشی زۆری خۆمان پێشکەش بە مامۆستای بەڕێزمان دەکەین و،.. داواکارین لە مەولا وسەرداری باڵادەست تەندروستی و لەش ساغی پێ ببەخشێت تاوەکو هاو وێنەی ئەم دانراوە ناوازانەمان پێشکەش بکات. هەروەها سوپاسی خۆمان ئاراستەی هەموو ئەوکەسانە دەکەین کە یارمەتیان داوین یان بەشداریان کردووە لە بەرهەمهێنانی ئەم کتێبەدا، بەم شێوازە جوانە.

ئەحمەد قوروجان

١٩٩٦/٣/٢١ ئەستەنبوڵ

## دەستپێك :

جیهاد بەوچەمکەی هەموان تێی بگەن بریتی یە لە جیهاد و هەوڵ و تەقەلا بۆ بەرز کردنەوی وشە و کەلیمەی خوا(كلمة الله) ئەم هەوڵ وتەقەلایە لەوکاتەی مرۆۋ لە سەر زەویدا خۆی بینیوەتەوە دەستی پێکردوە و بەردەوام دەبێت، هەتا خوای گەورە زەوی و ئەوەی لە سەر زەویە دەیباتەوە و نایهێڵێ، ئەو ناکۆکیەی لە نێو کوڕانی حەزرەتی ئادەمدا (سەلامی خوای لێبێت) ڕویدا یەکەم نمونەیە بۆ ئەم جیهادە.

جیهاد وشەیەکە لە زمانەوانیدا مانای زۆر هەڵدەگرێت، بە پێی ڕوداوو پێشهات و کەشی هەموو سەردەمێك فراوان دەبێت، جاری وا دەبێ بە بەخت کردنی شتانی بە نرخ وگرانبەها لە ماڵ و ساماندا دێتە دی، کاتی تر دەگاتە قوربانیدان بە نەفس لەم ڕێیەدا، لەم ڕوانگەوە ئەگەر پێناسە بکرێت بەوەی کە(کوشتاری دوژمنان)ە ئەمە تەنها تەسك کردنەوەی ئەو مانا فراوانەیەتی و هیچی تر.لەم سەردەمەی ئێستاماندا جیهاد تایبەتمەندی جیاوازی لە خۆ گرتووە، بە جۆرێك ئەم دنیایەمان وەك گوندێکی جیهانیی لێهاتوە، هاوکات هۆکارەکانی گەیاندن و پەیوەندی کردن ئێجگار فراوان بوون، بە جۆرێك خەیاڵ وێنای ناکات، ئەو هاوسەنگی هێزەش لە جیهاندایە بە بەراورد بە چەرخەکانی پێشو –تاڕادەیەك– ماناو چەمکەکانی لە دەست داوە ، بێگومان شێوازی جیهادیش جیاواز دەبێ لەم چەرخەدا، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ماناو

ناوەڕۆکی جیهاد گۆڕا بێت.مامۆستا (بەدیعو زەمان سەعیدی نورسی) ڕوانگەیەکی نوێی خستوەتە سەر زاراوەی جیهاد بەوەی کە دەڵێت: "سەرکەوتن بەسەرکەسانی خاوەن شارستانیدا بە قەناعەت پێکردنیان دەبێت".ئەگەر وێنای رەوتە فەلسەفیەکان و مەزهەب و ڕێڕەوە عەقڵییەکان بکەین لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیو جیهانی ڕۆژئاوادا، بێگومان گەیاندنو تەبلیغی ئیسلام بەو خەڵکانە بەو مانا تەسکەی نابێت بۆجیهاد واتە بە جەنگ(قیتال) کە لەوەو پێش باسمان کرد ، بۆیە جیهاد کردن لەگەڵ ئەوانەدا بە هەڵسەنگاندن و بەراورد دەبێت لەگەڵ یەك بە یەکی ئەو دەستورو پرۆگرامەی ئەوان پێی ڕازین، لەگەڵ یاسا و دەستورەکانی ئیسلامدا. بەڵێ، بێگومان جیهاد لەگەڵ ئەوان بەم شێوازە نەبێ–ت نایەتە دی، کەشێوازی قەناعەت پێکردنە.لە هەمان کاتدا جیهاد –تەنانەت جیهادی مادیش– تەنها لەسەر پیاوان پێویست نیە ، بەڵکو ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی هەموو موسوڵمانێك کە مەرجەکانی(تەکلیف)ی لەسەر بێت ئیتر پیاو بێت یان ئافرەت. ئەگەر چاوێك بگێڕین بەو ئایەتە پیرۆز و فەرمودە بەرزانەی پەیوەندییان بە جیهادەوە هەیە ئەم ڕاستییە بە ڕوونی دەبینین، بێگومان نمونە پیادە کراوەکانی "چاکترین سەردەم" و چەندین سەردەمی دواتریش پڕدەکات. خۆ ئەگەر نمونەی زیندوشمان بوێت بۆ ئەم ڕاستییە لە مێژووی نزیکدا، ئەو جەنگانەی لە دەوروبەری ئەنادۆڵ و، لە جەنگی (قەڵای چناق)دا ڕویاندا بەڵگەن لەسەر بەشداربونی پیاو و

ژن پێکەوە لەجیهاددا. بگرە هەموو پیر و منداڵەکانیش بە جۆرێك لەجۆرەکان بەشداریان کردو، بە سوار و پیادەوە لە ڕێگەی خوادا چوون بۆ جیهاد.لە فەرمودەکانی ڕەسولی ئەکرەمداﷺ جیهاد کراوە بە دوو بەشەوە: جیهادی گەورە(أکبر)و، جیهادی بچوك(أصغر). لە ڕاستیدا ئەم دابەش کردنە دوو ڕووگەیە بۆ یەك حەقیقەت. مەبەست لە جیهادی گەورە: بریتی یە لە بڵند بوونەوەی مرۆڤ بۆ پلەو پایەی مرۆڤایەتی ڕاستەقینە لە ئاست ژیانی دڵ و ڕۆحیدا، واتە مرۆڤ موجاهەدەی نەفسی خۆی بکات بە درێژایی ژیانی و لە گشت بەشێك لە بەشەکانی ژیانیدا، بگرە لە خواردن و خواردنەوە و سەفەر و نیشتەجێیدا. ڕووبەڕووی هەر شتێ دەبێتەوەکە خوای باڵادەست پێی ڕازی نییە... بەڵام جیهادی بچوك: بریتی یە لە جیهادی مرۆڤ بە ماڵ و سامانی و، بە نەفسی لە ڕێگەی خواداو، لە پێناو پاراستنی موقەددەساتی دا، ئەگەر پێویستیش بکات ، ڕوو بەڕوو لەگەڵ دوژمناندا بەشەڕدێت.بە پێی ئەم چەمکە فراوانە بۆ جیهاد، جیهادی گەورە ئەو ڕێگەیە کە ئادەمیزاد بە درێژایی ژیانی دەیگرێتە بەر، لە هەر شوێنێك بێت و هەر چۆن و لە هەر بارو دۆخێکدا بێت، بەڵام جیهادی بچوك بریتی یە لە پیادەکردنی ئەو جیهادە هەر کاتێ پێویست بێت و لە چەند کات و ساتێکی دیاریکراودا.

لە ڕاستیدا مەرجی سەرەکی بۆ هاتنە دی جیهادی بچوك، پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە بەوەی موجاهیدەکان لە نەفسی خۆیاندا

چەندەیان لە جیهادی گەورە هێناوەتە دی و، پێوەی پەیوەست بوون و بە حەزو تاسەوە پێداگریان لەسەرکردوە. بەڵێ ناگونجێ مرۆڤ تام و چێژی سەرکەوتن بکات ئەگەر بۆ ئەم ڕاستیيانە نەژی و، لەهەموو مەیدانەکاندا بەرگری و پارێزگاری لەم ڕاستیانە نەکات. لەبەر ئەوە لەسەر پاڵەوانانی جیهاد پێویستە لەگەڵ خودی خۆیاندا تێبکۆشن و لە جیهادێکی بەردەوامدابن، تا ببنە کەسی قیامەتی و هەر لەم دنیایەدا لە ماڵ و مەنزڵگەکانی ئاخیرەتدا هاتووچۆ بکەن، دوای ئەمەش پێویستە لە سەریان دەستی فریاگوزاری بۆ دڵە تینووەکانی حەق و حەقیقەت درێژ بکەن.ئەگەر بەوردی چاوێك بە مێژوودا بگێڕین، دەبینین ئەوانەی بەشێوەیەکی جوان و ڕاست و وەك پێویست ئیرشاد و تەبلیغیان کردوە، هەموویان ئەم ڕێگەیان گرتوەتە بەر. سەرەتا پێغەمبەران (علیهم السلام) تا دەگاتە ئەصفیاو ئەولیا، یان ڕوونتر بڵێین سەرەتا لە سەردارمان پێغەمبەری ئازیزﷺ تا دەگاتە ئیمامی ڕەببانیو شێخی گەیلانیو مەولاناخالیدو بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی هەموویان ئەم ڕێگەیەیان گرتووە و ڕێبواری ئەم ڕێیەن، هەر لەبەر ئەمەیە خوای گەورە بە پێی ئیخلاصو ڕاستگۆییان لەگەڵ خوادا، هێزو کاریگەری بە وتەو گوفتارەکانیان بەخشیوە، تا وای لێکردون –هەر لە سەردەمی خۆیانەوە هەتا ئێستاش– شوێنەوار و یادگاریە پاك و جوانەکانیان بە زیندو بمێننو، دڵی ئیمانداارانی بۆ کردونەتەوە، هەروەك بڵێی نەمری کردون و هەمیشە چاکەو حەسەناتیان بۆ تۆمار دەکات.جیهاد لایەنێکی

تری هەیە ئـەویش لایـەنێکی زۆر گرنگە کـە هـەموو کۆمەڵگـە لـە خـۆی دەگرێتو، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بەشێکە لەو کۆمەڵگـەی کـە تیایـدا دەژی و، کۆمەڵگەش خـۆی لـە چـەند تاکێـك پێـك هـاتووە. ئـەو کۆمەڵگایـەی لەکاتی جێبەجیٚ کردنـی فـەرزی جیهـاددا ئامـانجی هـەموو تـاکێکی لـە پلەی یەکەمدا بریتی بێت لە جیهاد لەگـەڵ نەفسـی خۆیـدا ، بـە ڕاسـتی ئەوە کۆمەڵگایەکی پێکەوە بەستراو وگریٚ دراوەو، هەموو دەرگاکانی لە بەردەم ڕوداوەکانی زەمانـە و کارەسـاتی چـەرخەکاندا داخسـتووە، بـە جۆرێك هەموو تاکێـك لـەو کۆمەڵگـە ئـەرکی خـۆی جیٚبـەجیٚ دەکـات و کۆڵی خۆی لە ڕەهەندی ماددی و مەعنەویدا ئامادە دەکات، ئیـدی هـیچ شتێك ناتوانیٚ ببێتە ڕێگر لە ڕێـی ئـەو ئامـانج و مەبەسـتانەدا کـە بـۆی دەڕوات.هیچ کۆمەڵگە و نەتەوەیەك نی یە کەسانێکی تێـدا نـەبێت –لـە هەر سەردەمێکدا بـن– کـە پێویسـتیەکی زۆریـان بـە ئیرشـاد و تـەبلیغ نەبێت. لەبەر ئەوەی ئەو ئیماندارانەی لەگەڵ ئەم کەسـانەدا دەژیـن کـە لە دۆڵی گومڕایدا دێن و دەچن و بۆ ڕێگەی ڕزگاری دەگـەڕێن و ژیانیـان لە پێناو نەبوودا لەناو دەبەن و ونـی دەکـەن ، ئـەو ئیماندارانـە ناچـارن لەگەڵ ئەوکەسانەی کە لە یەك کەشتی ژیاندا لەگەڵیان هاوبەشن فەرزی جیهاد جیٚبەجیٚ بکەن. وەك مرۆڤ ئەمە فەرز و ئەرکی سەرشـانیانە. لـە لایـەکی تـرەوە ئەرکێکـە لـە سـەریان خـودا پـیٚی سـپاردون و بـۆی نوسیون. هەموو مرۆڤێك فەرمانبەردارە بە جیٚبەجیٚ کردنی ئەم ئەرکە، لە چوارچێوەی شوێن و پێگەو ئەو بارودۆخەی کـە تێیدایـەو، بـە پـیٚی

ئەو تواناو ئیمکاناتــەی لەبەر دەستیدایە. بە پێچەوانەشــەوە لـە ڕۆژی حەشــری مەزنــدا ڕوو بــە ڕووی لێپرســـینەوەی زۆر قــورس و گــران دەبێتەوە.لەڕاستیدا گەلانی زۆر و زەبەنـدە هـەن بـە باڵادەسـت بـوونی ڕۆڵی ئیسلام لـە جیهانـدا ئۆقرەیـان لێ دەبـڕێ و، ئـەوەش بـە درێـژایی مێژوو لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسی و دواجاریش عوسمانییەکاندا بە دەست هاتووە ، ئەوانە چاویان لـە ئاسـت حەقیقەتـدا دەنـوقێنن، بۆیـە گاڵتەجاڕیە چاوەڕوانی بۆچوونێکی تریان لێبکرێـت. هـەروەك ئاشـکرایە –لەم ڕۆژانەی ئەمڕۆماندا– هەرچەندە چەندین سـەدە تێپـەڕیوە بـەڵام دوژمنانی ئیسـلام تـاکو ئێسـتاش دوژمنایەتیەکـەیان بەردەوامـە و لـەو پەڕی توند و تیژیدایە، دەیانبینی ڕێگەیەکی دوو فاقەیان گرتوەتـە بـەر و، هەرچی خراپەکان هەن دەیانخەنە ئەستۆی ئیسلام. ڕۆژئاواش بـەبێ شومار کتێب و نوسراو بڵاو دەکاتەوە و، چەندین قەڵەمی ڕام کردوە بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو فیکر و بۆچونە ڕۆژئاواییانە بە هەموو جیهاندا و، وای لە خەڵکی کـردووە کـە بـاوەڕی پێبکـەن، لـە لایـەن خۆشـیانەوە وایـان حیسـاب کـردوە کـە دۆزەکـە دۆزی نێـوان ئیسـلام و مەسـیحییە و بـە درێژایی چەندین سەدە بەردەوام بووە و، هـیچ کـات ئـەم سیاسـەتەیان نـەگۆڕیوە و، موسـوڵمانەکان لـە دیـدی ئەوانـدا دڕنـدەی پـەلاماردەر و، بکـوژ و خـوێن ڕێـژن و، تاوانبـار و سـوکن... چـەندە جـێی داخ و پەژارەیە ! لەم جیهانەی ئێمەشدا چەند ڕۆشـنبیرێك هـەن –بـا کـەمیش بن– باوەڕیان بەم درۆ و دەلەسە کردووە.بێگومان لــە کتێبــی(النــور

الخالد محمدﷺ مفخرة الإنسانية)[1] دا ئەم چەمکە فراوان و گشتیەمان بۆ جیهاد بە شێوەکی فراوانتر و لەگەڵ هاوردنی چەندین نمونەی زۆر لە سەردەمی پێغەمبەردا، وەلآمی ئەو ڕەخنانەمان داوەتەوە کە ڕۆژئاوا لە بارەی جیهادەوە بلآویان دەکاتەوە، لەبەر ئەوە بە پێویستی نازانین جارێکی تر لە دەرگای ئەو بابەتە بدەینەوە.بێگومان لەوکتێبەدا ڕونمان کردوەتەوە: ئەسڵ و بناغە لە ئیسلامدا ئاشتی یە نەك جەنگ ، هەروەك باسی ئەوەمان کردووە: ئەو هۆکارانەی جەنگ پێویست دەکەن، بەرگری لە خۆ کردن و، سنورداركردنی ستەم و، کردنەوەی دەرگای ئاوەلآی ئیرشاد و تەبلیغە، ئەوەی دەیەوێ با سەر لەو کتێبە بدات.

هەر لە ساتەوەختی سەرهەڵدانی ئیسلامەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان چەمکی جیهاد بە شێوەی تیۆری(نظری) نەماوەتەوە، بەڵکو لە هەموو سەردەمێکدا کەسانێك پەیدا بوون کە بیکەنە کردار، بگرە بە جوانترین شێوەش لەژیاندا پیادەی بکەن. ئەوەی شایەنی باسە ئەوانەی لەسەر دەستیاندا سەرکەوتن بەدەست هاتووە (ئیترسەرکەوتنی تەواو بێت یان ناتەواو) لە کاتو ساتی تردا ژێرکەوتون و سەرکەوتنیان لە دەست داوە، بەلآم ئەصحابەی کیرام جیا دەکرێنەوە –لە نێوان نوێنەری هەموو سەردەمەکاندا– بەوەی کە هەمیشە لە چڵە پۆپەدا بوون و کەس نەگەیشتوەتە پلە و پایەی بەرزیان. ئەو ئیماندارانەی کە

---

١– سوپاسی خوای بالآدەست دەکەین کە برای بە ڕێزمان کاك حەسەن حەمە کەریم وەری گێڕاوە بۆ زمانی شیرینی کوردی.

ئەصـــحابەیان کردووەتـــە پێشـــەنگ و پێشـــەوای خۆیـــان (هـــەروەك پێغەمبەرﷺ فەرمانی داوە) هەر لە هەمان ڕێگەی ئەوانەوە دەڕۆن و، بە ئیزنـی خـوا لـە ڕۆژی دواییـدا لەگـەڵ ئـەوان حەشـر دەکرێن.ئێمـە لـەم کتێبـەدا هـەوڵمان داوە –هـەروەك دەردەکـەوێت– جـوانترین نمونـەی لایەنی کردەیی بۆ چەمکی جیهاد لـە ئیسـلامدا بهێـنین، بـەڵام حـوکمی جیهاد – بە پێی یاساکانی ئیسلام و بە گوێرەی ئـەو بـار و دۆخـەی لـە ئارادایە – جۆرا و جۆرن. ئەگەر ناوی خوا لـە شـوێنێکدا لـە بیرکرابـوو، فەرمان و نەهیەکانی پشت گوێ خرا بوون، جیهاد لەو شوێنەدا (فەرزی عەینــە) لەســەر هــەموو ئیمانــدارێك، بگــرە چــاکترینی هــەموو فــەرز و واجبەکانە و پێویستترینیانە، بـە تایبـەت ئەگـەر ئـەو کۆمەڵگایـە دیلـی دەسـتی ئـەو بۆچـونە بێـت بـە دامـەزراوە و ڕێکخراوەکانیـەوە. جیهـاد نابێتە (فەرزی کیفایە) هەتاکو ئەو دامەزراو و ڕێکخراوانـە – لـە بـەرەی ئیماندا – بە شێوەیەکی گونجاوو ڕێكو پێك کارەکانیان ڕانەپەڕێنن.

ئێستاش دەتـوانین بـەرەو بەشـەکانی کتێبەکـە بـڕۆین بـە واتـای جیهاد لە زمانەوانی و ئیسـتلاحدا دەسـت پێبکـەین ، پاشـان پێناسـەی ناوەڕۆکەکەی بە ڕستەی کورت و واتادار دەکەین.

# بەشی یەکەم

# چەمکی جیهاد

## ١- جیهاد چییە؟

جیهاد: وشـەیەکە پێـك هـاتوە لـە ڕەگـی: (ج. ه. د) واتـە هـەوڵ وکۆشش، ئەم وشەیە مانایەکی تری هەیە ئەویش بریتی یە: لە جیهادی مرۆڤ بەهەموو تواناکانیەوە بە ئارامگری لەسەر ناخۆشیەکان لە ڕێگـەی ئەوەدا بگات بە ئامانجێکی دیاری کراو، ئەم پێناسەیە بۆ واتـای جیهـاد نزیکترە، لە مانا شەرعیەکەی.

لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلامدا چەمکی جیهـاد تایبەتمەندیـەکی تـری وەرگرت، چونکە بوو بە ناوێك و دروشمێك بۆ گەیشتنی مرۆڤ بـە خـوای گـەورەو، نەهێشـتنی ئـەو بەربەسـتانەی لـە نێـوان خـۆی و خـوای باڵادەستدا هەن، لە ئێستادا هەرکە باسـی جیهـاد دەکرێـت ئـەم واتایـە دێتە زەینی مرۆڤەوە. جیهاد لـە ڕێگـەی خـوادا لـە دوو ڕووەوە دەبـێ، یەکەم: ڕووی لە ناخی مـرۆڤ و ناوەوەیـە، دووەم: ڕووی لـە دەرەوەیـە. دەتـوانین پێناسـەی هـەردوو جیهادەکـە بـەم جـۆرە بکـەین: هـەوڵو کۆششی مرۆڤە لە ناخی خۆیدا و لە گەیشتنی مـرۆڤ بـە خـودی خـۆی و

خودای خۆی، بەڵام ئەو جیهادەیان ئاراستەی دەرەوە کراوە بریتیە.
لە: کاری گەیاندنی خەڵکانی تر بە خودی خۆیان و، بەخودای خۆیان
یەکەمیان بە(جیهادی گەورە)و دوەمیان بە (جیهادی بچوك) دەناسرێت.
چونکە مرۆڤ بە یەکەمیان دوای بڕینی ئەو بەربەست و لەمپەرانەی لە
نێوان خۆی و دەرونی خۆیدا هەن، دەگاتە ناسینی خۆی، دواتر دەگاتە
ناسین و خۆشەویستی خودا و چێژولەزەتی ڕۆحی دەست دەکەوێت.
بەڵام دووەمیان لابردن و نەهێشتنی ئەو بەربەستانەیە لە نێوان مرۆڤ و
ئیمان بە خوادا، ئیتر بە هەوڵ و تەقەلا بێت یاخود بە جەنگ وقیتال
بێت، بۆ گەیاندنی بە خوای گەورە و پاشان ناسینی و بڵندبوونەوە لە
ناسینی خوادا. لە دیدێکی ترەوە مەبەست و ئامانج لە بە دیهێنانی
مرۆڤ جیهادە، چونکە هیچ کارێك لەوە گرنگتر و چاکتر نیە، ئەگەر وا
نەبوایە خوای گەورە پێغەمبەرانی نەدەنارد و ئەم ئەرکەی پێ
نەدەسپاردن. هەموو پێغەمبەران و ئەصفیا بە شێوەیەکی گشتی هەر
لە سەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە (علیهم السلام) یان لە ژێر سێبەری
شمشێردا یاخود بە لێپرسینەوە و محاسەبەی نەفس گەیشتونەتە پلەی
ئەصفیا و هەڵبژاردەکان. لێرەشدا جیاوازی بەرین هەیە لە نێوان
ئەوانەدا بە بێ بیانوو دادەنیشن و جیهاد ناکەن، لە گەڵ ئەوانەدا لە
پێناوی خوادا بە ماڵ و نەفس تێدەکۆشن ، ئەمەش هیچ شتێك پڕی
ناکاتەوە جیهاد نەبێ، ئایەتە پیرۆزەکەش ئەمە ڕون دەکاتەوە: ﴿لَّا
يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ

وَأَنفُسِهِمْۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةًۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ ﴾النساء:٩٥، واتە: (ئەو موسوڵمانانەی ساغ و سەلیمن و دەردو نەخۆشیان نییە،کەچی دانیشتوون و ناچن بۆ جیهاد،هەرگیز پایەیان وەکو ئەو موسوڵمانانە نییە کە بە سەرو ماڵ لەرێگای خودادا جیهاد دەکەن. ئەوانە کە بە سەرو ماڵ لەرێگای خوادا جیهاد دەکەن خودا فەزڵی داون بەسەر ئەوانەی دانیشتوان و عوزریان نییەو جیهاد ناکەن. جیهادکاران پایەی بەرزو بالآیان هەیە. خودا بەڵێنی بە هەموو موسوڵمانان داوە کە پاداشتی چاکیان بداتەوە، بەڵام جیهادکارانی فەزڵ داوە بەسەر دانیشتواندا و پایە و پاداشتی گەورەی بۆ داناون). پێغەمبەری خۆشەویستﷺ گرنگی جیهادی بەمەی خوارەوە ڕوون کردوەتەوە: (لَوَدِدْتُ أنّي أُقتلُ في سبيلِ الله ثُمّ أُحْيَا ثُمّ اُقتلُ ثمّ اُحْيَا ثُمّ اُقتلُ)[1] (من بە ئاواتم لەڕێی خوادا بکوژرێم پاشان زیندو بکرێمەوە و، پاشان بکوژرێمو زیندو بکرێمەوە، پاشان بکوژرێمەوە) مەگەرخودا بزانێ ئەگەر لەبەر درێژەدان بە فەرمایشتەکەی نەبوایە پێغەمبەرﷺ چەند جار ئەم دەستەواژە:(پاشان بکوژرێم و زیندو بکرێمەوە) ی دوبارە دەکردەوە، چونکە مەبەست لەم دەستەواژەیە شەهیدی بوو لەڕێگەی خوادا بەبێ شومار. ئەوەی جێی تێ رامانە ئەم حەز و ئاواتە لە گەورەی

١- مسلم، الإمارة، ١٠٣- ١٠٦، البخاري، الإيمان، ٢٦، النسائي، الجهاد، ٣٠، ابن ماجه، الجهاد، ١.

پێغەمبەران و ئیمامی ئەنبیاوەیەﷺ، بۆیە جارێکی تر دەفەرموێت: (رِباطُ يَومٍ في سَبيلِ الله خَيرٌ مِنَ الدُّنْيا ومَا عَلَيْهـا ومَوضِـعُ سَـوطِ أحَـدكُمْ مِنَ الجَنّة خَيرٌ مِنَ الدُّنيا وَماعَلَيها والرّوحَـةُ يروحُهَـا العَبـدُ في سَـبيلِ الله أو الغَدوَةُ خَيرٌ مِنَ الدُّنيَا وَمَا عَلَيْها)[1] ( ئێشك گرتنی ڕۆژێك لەڕێی خـوادا چاكترە لە دنیاو ئـەوەی لەسـەر دنیایـە، جـێی قامچی كەسـێكتان لـە بەهەشتدا چاكترە لە دنیاو ئەوەی لەسەر سەریەتی، بەندەیەك هەنگاو دەنێ و لە ڕێی خوادا دێت و دەچێت چاكترە لە هەموو دنیـاو ئـەوەی لەسەریەتی).

## ٢- جیهاد فەرمانێكی خواییيە:

ئەگەر ویستمان پوختـەی جیهـاد لـە درێـژایی ئـەو مێژوەیـدا كـە بەرجەسـتە بـووە، وەك فـەرمانێكی خـوایی لـە ژیـانی ئەصـحابە بەرێزەكانـدا كـە بـۆ یەكـەم جـار لەگـەڵ ئەوانـدا گفتوگـۆی كـردووە و فەرمایشتەكانی ئاراستەی ئەوان كراون، دەڵێین:

ڕوداوەكان دەری دەخەن ئەو بارو دۆخەی موسڵمانەكانی تێدا بوو لە مەككەی پیرۆزدا گەیشتە ڕادەیەك كە لەتوانا بەدەر بوو، بـە جۆرێـك هەندێكیان توانای بەرگەگرتنیان نەما ئیدی فەرمانی كۆچیان پێدرا. بـە مانـای جیهـادی ئەوانـە – لـەو بارودۆخـەدا – بریتـی بـوو لـە :كـۆچ (هیجرەت)، لـە ڕاسـتیدا دوای ماوەیـەك – هـەر وەك دواتـر دەبیـنین –

---

١– البخاري، الجهاد، ٧٣، المسند للإمام أحمد، ٣٣٩/٥ .

هیجرەت دەبێتە خودی جیهادو، هیجرەت دەبێتە مەرجی سەرەکی بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت بەیعەت بدات .

موسـڵمانەکانیش دوای هیجرەتـی وڵاتـی حەبەشـە هـەموویان هیجرەتیان کردەوە بۆ شاری مەدینە، بەم جۆرە لە سەردەمی مەدینەدا جیهاد شێوازێکی تری لە خۆ گرت چونکە بناغەکانی دەوڵەتی ئیسلامی ڕەگی داکوتا... کەواتە پێویستە جیهاد بە پـێی ئـەو بـارو دۆخ و کاتـە بێـت. جیـاوازی نیـە لـە ماهیـەتی جیهـاد و چـۆنیەتیەکەیدا، بـەڵام هەڵسەنگاندنی کارەکان بەپێی ئەو بارو زەمەنەیە لـەو کاتـەدا، گـرنگ ئەوەیە لە چاکسازی و نویێ بونەوەدا پارێزگاری لە توانای گۆڕانکـاری و ئاڵ و گۆڕەکان بکرێت ، ئەمەش هەندێ کـات پێویسـتی بـە خێرایـی و، هەندێ کـاتی تـر پێویسـتی بـە لەسـەرخۆیی یـە، بـەڵکو کـاتی وادەبـێ پێویستی بە وەستان یان ئەو پەڕی خێرایی دەبێت ...هەموو ئەمانە بە لایەنی کاراو (ستراتیجی) جیهـاد دادەنـرێن. هـەروەها زۆر سروشـتی یـە گرتنە بەری شێوازی جۆراو جۆر بـە پـێی گۆڕانکـاری ڕووداوەکـان لـەو سات و وەختەدا.

پێش ئەوەی مۆڵەت بە جیهاد بـدرێت، موسـوڵمانان دەسـتیان بـۆ هیچ نـە دەبـرد و لـە بەرامبـەردا بەرپەرچـی ئـەو دوژمنکـاری و دەست درێژیەیان نە دەدایەوە کە دەکرایە سـەر مافـەکانیان، واتـە بەرگریـەکی نیگـەتیڤ و سـلبیان ئـەنجام دەدا، بـەڵکو هـەر بیریـان لـە بەرهەڵسـتی مادیش نەدەکردەوە، دەستدرێژکاریش هەمیشـە لایـەنی کـوفر بـووە و،

موسڵمانەکانیش لە بەرەی ستەملێکراودا بوون و مافەکانیان پێشێل کراوە. ئەم بارودۆخە تا ماوەیەك دوای هیجرەتیش بەردەوام بوو، لە کۆتاییدا ڕێ بە باڵەکەی تری جیهاد درا و، ئەم ئایەتە پیرۆزە نازڵ بوو:

﴿ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ﴾ الحج: ٤٠،

واتە: (خوا ڕوخسەتی داوە بەو موسوڵمانانەی کە کافرەکان جەنگیان لەگەڵ ئەکەن، ڕوخسەتی وەڵامدانەوە و شەڕکردنی لەگەڵیان داوە چونکە ستەمیان لێ کراوە و خوا توانای ئەوەی هەیە یارمەتیان بدا و سەریان بخا بەسەر ئەو کافرانەدا . ئەوانەی بە ناحەق لەسەر ماڵ وحاڵی خۆیان دەرکراون تەنها لەبەر ئەوەی ئەڵێن پەروەردگاری تاك و تەنیای ئێمە زاتی خوایە....).

ئەوانەی بەرهەڵستی دەکران لە بەکارهێنانی شمشێر، ئێستا ڕێیان پێدرا خۆیان پڕچەك بکەن و، بە پەرۆشەوە بەدەم جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانەوە چوون ، چونکە دەمێك بوو لە چاوەڕوانی کاتی گونجاودا بوون بۆئەم فەرمانە و، بۆ پیادەکردنی ئەم مۆڵەتە ئارامیان لێ بڕابوو.

پاش ماوەیەك جیهاد لەوە دەرچوو کە تەنها ڕێگەی پێ بدرێت، بەڵکو بووە فەرمانێکی خوای گەورە. دوای ئەمە موسڵمانەکان ناچار بوون بە شمشێرەکانیان جیهادی ماددی ئەنجام بدەن. هەتا کاتێك دەرچون بۆ جەنگی بەدر لە خۆشی وکەیفێکی وەهادا بوون وەك لە

بەهەشتەوە بانگ کرابێتن. ئیتر سەروماڵیان لەو ڕێیەدا لەلا بێ بایەخ بوو . بەڵێ، هەموویان بە تاسە و حەزێکی بێ وێنەوە چاوەڕێی مردن بوون. هەر لەبەر ئەوە بوو کاتێك بانگ کران بۆ جیهاد جگە لە دووڕووەکان (مونافیقەکان) یەك کەسیان دوا نەکەوت، کە هەردەم ڕۆحی فەسادو خراپەیان لە ڕیزی موجاهیدەکاندا بڵاو دەکردەوە و، زۆر جاریش سەنگەریان چۆڵدەکردو، لە کۆمەڵگە جیا دەبوونەوە و، پێغەمبەریانﷺ لەوێدا جێدەهێشتو، لە کاتە زۆر ناسکەکاندا سستیان دەنواندو خۆیان لە جیهاد دوا دەخست. ئەوانە ناخیان سەفاوپاکی ئیمانی نەدەناسی و، نەیانتوانی بەسەر ئەو دوو ڕووییەدا کە لە جیهانی ناخ و ویژدانیاندایە سەر بکەون، بە جۆرێك لە حەزو ئاواتە کەسیەکانیاندا ڕۆچووبوون و، لە هاوەڵە موجاهید و تێکۆشەرەکانیان گۆشەگیر بوون و لە مەیدانی جەنگیشدا نەچوونە ناو هێڵی ئاگرەوە. بە ڕاستی مونافیقەکان خاوەن ڕۆحی نزم و دیلی دەستی نەفس و ئارەزوو بوون.

بەلام ئیماندااران! ئەوانەی ئیمانەکەیان بە خواو پێغەمبەرﷺ تێکەڵ بە دڵ و ڕۆحیان بوو بوو، کەسیان جێگەوشوێن و سەنگەری خۆی بەرنەدا، واتە ئەوانەی جیهادیان پێ ڕاگەیەنرا هیچ کام پاشەکشێیان نەکرد و لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا بوونە ڕێبوارانی ڕێی حەق. ئەوانەش دانیشتن و دواکەوتن، کەسانێك بوون سەرگەردان و

ڕاڕابوون، بە تەواوی حەقیقەتیان نەدەناسی و، تێکەڵ بە ڕۆح و ویژدانیان نەبوو بوو.

بەڵێ، کەسی ئیمانداری موجاهید مرۆڤێکە وەك مرۆڤەکانی تر، ئەکرێ مردنی پێ ناخۆش بێ هەروەك قورئان ئەم هەستەمان بۆباس دەکات: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰ أَن تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ ﴾ البقرة: ٢١٦، لەگەڵ ئەوەی ئەمە شتێکی چێنراوە لە سروشتی مرۆڤدا، بەڵام ئەصحابە بەڕێزەکان (خوایان لێ ڕازی بێت) گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرﷺ بوون و بە بێ دانانی هیچ مەرجێك و بێ دوو دڵی و لە ڕوو دامانێك خۆیان تەسلیمی ئەو کردبوو ، هەر لەبەر ئەوە بوو بەردەوام میهری پەروەردگاریان بەسەردا دادەباری، چونکە بەندایەتی پاك و بێگەردیان ئەنجام داو بە چاکیش شوێن پێی پێغەمبەریانﷺ هەڵدەگرت. ئابەم جۆرە سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتن دەهات و، هێزی موسڵمانان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبوو، مژدەی سەرکەوتنەکانیش بە زوویی لە نێو هۆزەکاندا تەشەنەی دەکرد، هەر وەك چۆن موسڵمانانی دڵخۆش دەکرد، کافرەکانیشی خەمبار و نیگەران دەکرد.

## ٣- جۆرەکانی جیهاد

### أ- جیهادی گەورەو جیهادی بچووك

جیهادی بچوك تەنها ئەو جیهادە نیە لە بەرەکانی جەنگدا پیادە دەکرێت و بەس، ئەم تەرزە بۆچوونە ئاسۆکانی جیهاد تەسك دەکاتەوە، چونکە مەیدانی جیهاد لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا درێژ دەبێتەوە و زۆر فراوانە ، سەرەڕای بەرفراوانی و گشتگیریەکەی دەگونجێ جیهاد بریتی بێ لە: تەنها وشەوگوفتارێك یان بێدەنگیەك یان زەردەخەنە و ڕووخۆشیەك یان ناوچاوان گرژ کردن و پشت هەڵکردنێك، یاخود جێهێشتنێك، یاخود بەشداری کردنی کۆڕێك... بە کورتی هەستانە بە کردنی هەر کارێك لە پێناوی خوادا و، ڕێکخستنی "خۆشەویستی لەبەرخوا "و "رقبون لە بەرخوا" لەم ڕێیەدا، کەوابو هەموو هەوڵێك لەم پێناوەدا بۆ چاکسازی کومەڵگە، لە هەر مەیدانێك لە مەیدانەکانی ژیاندا یاخود بۆ هەر چینێك لە چینەکانی کۆمەڵگە بدرێت، هەموو ئەمانە لە چوار چێوەی جیهادی ئیسلامیدان.

بەو مانایەی ئەوەی کە جێبەجێ دەکرێت لە بواری خێزان و خزم و دراوسێی دوور و نزیکدا... هەر هەموو ئەمانە لە جۆری جیهادی بچوکن، ئەمانە وەك بازنەی یەك لەناو یەك وان، بە ئەندازەی فراوانی گۆی زەوی فراوانن.

بەڵێ، جیهادی بچوك تەنها یەکێك لە مانا و ڕاڤەکانی "جیهادی ماددیە". بەڵام جیهادی گەورە لایەنی مەعنەوی جیهاد دەگرێتەوە، کە

بریتیه له جیهادی مرۆڤ– بۆ نەفسی خۆی و پاكـژكردنی دڵ و دەرونـی، هـەركات مـافی ئـەم دوو جیهـادە پێكـەوە دران، ئەوكاتـە هاوسـەنگی پێویست دروست دەبێت. بەڵام بە پێچەوانەوە هەر كـەم و كورتیـەك لـە یەكێك لـەو جیهادانـەدا دروسـت بـوو، ئـەو هاوسـەنگیەی كـە لـە ڕۆحـی جیهاددا هەیە تێك دەچێت.

ئیماندار ئەو مرۆڤەیـە كـە ئامـانجی ژیـانی لـە چوارچێوەی ئـەم هاوسـەنگیەدا بـۆ ڕاپەڕانـدی جیهـاد دەدۆزێتـەوە. بـەڵێ ئیمانـدار وەك دارێكـی بـەردار وایـە، پارێزگـاری لـە چـالاكیەكانی دەكـات هـەتا بـەری هـەبێت، كـاتێكیش لـە چـالاكیەكانی كـەوت و بـەری نـەما ئیـدی وشـك دەبێت و لەناو دەچێت.

ئەگەر ویستان سەرنج لە سیمای ڕەشبینەكان بدەن، دەبینی هـەر ئەوانەن كە وازیان لە جیهاد هێناوە، لەبەر ئەوەی حەق و حەقیقەت بـە كەسـانی تـر ناگەیـەنن خـوای بەخشـندەش ڕێژنـەی نـوری خـۆی لێگرتونەتـەوە. ئیـدی جیهـانی ناوەوەیـان تاریكـە و بووەتـە شـوێن جێیەكی وشك و بێ بەر. سەیری تێكۆشەران بكەن هەمیشە لـە خۆشـی و شادمانیدان و جیهانی ناوەوەیـان پڕیـەتی لـە نـوور و، هەستەكانیان چلاكانە و بەناسكی لێ دەدات، چونكە هەمیشـە لـە هـەوڵ و جیهـاددان بۆ گۆڕینی تاكێك بۆ هەزار، بەڵێ هەموو جیهادێك جیهادێكی تر بەرهـەم دێنێ، هەموو خەیر و چاكەیەك دەبێتە وەسیلە و هۆكـار بـۆ چـاكەیەكی تر، چـونكە ئـەوان لـە نـاو خێـر و چـاكەدا دێـن و دەچـن ، ئـەم ئایەتـە

پیرۆزەش زمانی گوفتاری خۆی ئاراستەی ناو ویـژدانمان دەكـات و ئـەم ڕاســـــتیەمان فێردەكـــات: ﴿ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ فِينَا لَنَهۡدِيَنَّهُمۡ سُبُلَنَاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٦٩﴾ ﴾ العنكبـوت: ٦٩، واتــە: (ئەوانــەیش كــە لــەڕێگای ئێمــەدا تێكۆشاون وخوا پەرستی ڕاستیان كردووە ، ئێمە لەپاداشتی چاكەیانا شارەزای ڕێگەكانی خۆمانیان ئەكەین و خـوایش لەگـەڵ ئـەو كەسـانەیە كە چاكە ئەكەن).

## ب- ئەو ڕێیانەی دەمانگەیەنن بە خوای گەورە

ئەو ڕێیانەی دەمانگەیەنن بە خوای گـەورە بـە ئەنـدازەی ژمـارەی دەروونـەكان زۆر و جـۆرا و جـۆرن. گومـانی تێـدا نیـە ئەوانـەی كـە لـە پێناوی خـوای باڵادەسـت(سـبحانە وتعـالی)دا تێدەكۆشـن هیدایـەتیان دەدات و دەیانخاتە سەر ڕێیەك یان چەند ڕێگەیەك لـەو ڕێیانــە، هــەموو چاكەكان لەبەردەمیاندا رادەخات و لە ڕێی خراپ و ناڕەوا دەیانپارێزێ.

ڕێگـەی خـوا ڕێگـە ڕاسـتەكە (صـراط المسـتقيم)ە، ئـەوەی ئـەو ڕێگەیەی دۆزیەوە ڕێگەی ڕاستی دۆزیوەتەوە. بەڵێ، هــەروەك چـۆن لـە نێـوان هێـزی تـوڕەیی و عــەقلی و ئـارەزودا ڕاسـتەڕێ بریتـی یـە لـە: "نێوەنـد" .هــەروەها لـە نێـوان زیـادەڕەوی (الإفـراط ) و كەمڕەویشـدا (التفريط) ڕێی"نێوەند" جیهاد و عیبادەتـە، چـونكە ئیمانـدار هەمیشـە مامناوەنـد وەردەگـرێ و هەڵدەبـژێرێ. واتــە خــوای گــەورە (سـبحانە وتعالی) هەمیشە مرۆڤ ڕێنمونی دەكات بۆسەر ڕێگەڕاستە ناوەنجیەكـەی خۆی. ئەوجیهادەی كە ڕووی لە دەرەوەیە هەرچەندە خۆبەخت كردن و

فیداکاری زۆریشی تێدا بێت، هەر دەکەوێتە بازنەی جیهادی بچوکەوە.
ئەم جیهادە بچوکەش لەچاو جیهادی گەورەدا بە بچوک دادەنرێت، دەنا هیچ ڕوویەکی بچوکی تێدا بەدی ناکرێت، بگرە پێچەوانەکەی ڕاستە چونکە ئەو دەرەنجامەی لێی دەکەوێتەوە لەوپەڕی گەورەییدایە. چۆن گەورە نەبێ کە موجاهید ساز و ئامادە دەکات بۆ چوونە بەهەشت، خۆ ئەگەر شەهید بوو دەبێتە خاوەنی ژیانێکی تەواو و ڕاستەقینە لە بەرزەخدا. گومانی تێدا نیە کە ئامانجی هەردوو جیهادەکە گەیشتنە بەڕەزامەندی خوای گەورە، ئیدی جیهادێك ئەم هەموو ئەنجامە بەرزانەی هەبێت چۆن بچوك دەبێ ؟. کەواتە جیهادی بچوك گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئایینە بەشێوەی کرداری و جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانەیە کە خراونەتە ئەستۆی مرۆڤەوە. بەڵام جیهادی گەورە ڕاگەیاندنی جەنگە لەگەڵ هەموو ئەو لەمپەر و بەربەستانەی کە لە دەرونی مرۆڤدا خۆیان مەڵاس داوە و دەبنە ڕێگر لە گەیشتنی بە کەماڵات، وەك ڕق لێبونەوە و حەسودی و خۆپەرستی و خۆ بەگەورە زانین و لەخۆبایی بوون و شانازی و هاوشێوەی ئەو کردەوانەی کە نەفسی بەدخواز خووی پێوەگرتوون، ئەم جیهادە زۆر قورس و گرانە، هەر لەبەر ئەوەیە ناوی جیهادی گەورەی لێنراوە.

بێگومان گوزەری ژیان لە بازنەو خولگەی خۆپەرستی دا زۆر ترسناکە، مرۆڤیش کاتێك کە سەرقاڵە بە جیهادی مادییەوە – لە زۆربەی کاتەکاندا – هەلێکی وەهای لە بەردەستدا نیە بۆ گوێگرتن لە

داواکانی دەروونــی، دەشــگونجێ ئــەم ترســناکیەی تێپەڕانــدبێ، بــەڵام هــەرکات وازی لــەجیهادی مــاددی هێنــا ئــەوکات نەفســی ســەردەکاتە ئارەزووەکـانی و لێـرەوە هێرشـی ترسـناکی نـەفس دەسـت پێـدەکات، ئەمەش بە مانای لاوازی ژیانی دڵ و ڕۆحی ئەو کەسە دێت.

ئەو کەسەی تووشی ئــەم ڕوبەڕوبونەوەیــە دەبێــت بــیر و بۆچــۆنی خــراپ لــە هــەر چــوار لاوە دەوری دەدەن و ژیــانی مەعنــەوی توشــی ئیفلیجی دەکەن، بۆیــە زۆر ئەســتەمە مــرۆڤ بــەبێ ئــەوەی هەســتێت بــە جیهادی ماددی بتوانێت پارێزگاری لە نەفسی خــۆی بکــات. هــەر لەبــەر ئەمەیــە گــەورەترینی ئاســتەنگەکان ئەوەیــە کــە پێغەمبــەرﷺ ئامــاژەی پێدەکات، کاتێك لە یەکێك لە غەزوەکان گەڕایەوە فەرمووی (رجعنا من الجهاد الأصغر إلى الجهاد الأكبر)[1]، مانــای فــەرمودە پــیرۆزەکــە ئەوەیــە: ئێمە ئیمانمان هێناو شەرەفمەند بــووین و لــە غەزوەکانــدا بەشــداریمان کــــردووە، لەوانەشــــە هەنــــدێك دەســــکەوت(غەنیمــــە)مــــان دەســــت کــــەوتبێت ...دەگــــونجێ دوای ئــــەوە حــــەز و ئــــارەزوی پاڵدانــــەوە و خاوبونەوە و پشودان و هەندێ جاریش هەستکردن بە لەخۆبایی بــوون، لــە نەفســی بەدخوازمانــەوە – لــە ڕێــی جیاجیــاوە – دزە بکاتــە نــاو ڕۆحمان و خراپی بکات. یانی دوای جیهادی ماددی چەندین مەترســی و ترسناکیی زۆر هەن چاوەڕێمان دەکــەن ، ئــەو جیهــادەی لــە دوای ئــەو جیهادەوە دەستی پێ دەکەین قورس وگرانتر و جێی بایــەخی زیــاترە،

---

١- تأريخ بغداد للبغدادي ١٢/٥٢٣، كشف الخفاء للعلجوني ١/٤٢٤-٤٢٥.

کەواتە دەبێت هەمیشە پارێزگاری لەو حاڵەتە بکەین و بەردەوام لە خۆئامادەکاریدا بین.

ئەو کەسانەی فەرمودە پیرۆزەکەیان ئاڕاستە کراوە پاش ئەصحابەی کیرام ئەوانەن دوای ئەوان دێن، بە تایبەتیش ئێمە لەوانەین کە فەموودەکە دەمانگرێتەوە. بۆیە دەبێت زۆر هۆشیاربین لە بەکارهێنانی ئەم پێوەرانەدا.

ئەگەر مرۆڤ هەڵس و کەوتەکانی لە جیهاددا تەنها بۆ دەرەوەی نەفس و دەرونی ئاڕاستە بکات و، خۆی بە دووربگرێت لە چاودێری و موراقەبەی نەفسی، بەمە دەکەوێتە سەر لێواری کەندەلانێکی زۆر ترسناك .

## ج- تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرﷺ

خەڵکانی چاکترین سەردەم(خیر القرون)، سەردەمی نبووەت، لە ڕۆژدا وەك شێری ناو بێشە بوون و، کاتێك کە شەو پەردەکانی دادەدرانەوە وەك زیوار(راهب) وەهابوون، هەموو شەویان هەتا بەرەبەیان بە پەرستش و زیکر و تەسبیحات زیندو دەکردەوە. هەروەك بڵێی ئەوان لە ڕۆژدا دەستبەتاڵ بوون و، ئەو تێکۆشەر و موجاهیدانە نەبوون کە بە گژ ناخۆشیەکاندا دەچونەوە، بەڵکو وات هەستدەکرد کە ئەمانە تەنها خۆیان بۆپەرستش تەرخان کردووە....

بەڵێ، ئەمان ئەم شێوازەیان لەسەرکردە و پێغەمبەری پێشەوایانﷺ دەبینی. با لێرەدا چەند نمونەیەك ببینین. ڕەسولی

ئەکرەمﷺ نمونە و ئەدگاری بوێری بوو، گەورەمان حەزرەتی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) – کە پاڵەوانێکی ئازاو بوێر بووە – ڕیوایەتی دەکات و دەفەرموێت: (كُنا إذا احمرّ البأسُ و لقيَ القومُ القومَ أتّقينا بِرسُولِ الله فَما يَكُونُ مِنّا أحَدٌ أدنَى مِنَ القَومِ مِنهُ)[1] (کاتێك کە جەنگ گەرم دەبوو و تێك دەڕژاین، خۆمان دەدایە پاڵ ڕەسول اللهﷺ، کەسێکمان لەو نزیکتر نەدەبوو لە دوژمن). بۆ نمونە لە غەزای حونەیندا (... طفِقَ رَسُولُ اللهﷺ يركُضُ بَغْلَتَهُ قِبَلَ الكُفارِ قالَ عَبّاسٌ وأنا آخِذٌ بِلجامِ بَغْلَةِ رَسولُ اللهﷺ أكُفّهَا إرادةَ أنْ لا تُسرِعَ.. وأبُو سُفيانَ بنُ الحَارِث بنِ عَبدِ المُطلبِ يَقودُ بِهِ فَنَزَلَ فَاستَنصرَ وقال: أنا النبيُّ لا كَذِبْ أنا ابنُ عبدِ المُطّلبِ..)[2]، (وڵاخەکەی بەرەو ڕوی کافرەکان غار دەداو حەزرەتی عەباسیش لغاوی وڵاخەکەی گرتبوو بۆ ئەوەی ئەوەندە بە پەلە نەبێت... دەیفەرموو: بە بێ درۆ من پێغەمبەرم، من کوڕەزای عبدولموتەلیبم). ئا ئەمە وێنەیەکی جوانی ئەو خۆشەویستەیەﷺ، هەروەك نمونەی کەماڵی ئازایەتی و نەبەردی و پاڵەوانیەتیە، هەروەها لە پەرستشەکانیدا لە مونتەها و دوامەرتەبەی بەندەگی و پەرستشدا بوو، هەتا لە تاو گریان سنگی موبارەکی دەنگێکی وەك گیزەی مەنجەڵی لێوە دەهات. هەرکاتێك فرمێسکی دەباراند ئەوانەی دەوروبەری دڵیان نەرم دەبوو... ئەو خۆشەویستە ئەوەندە بە ڕۆژو دەبوو، تا دەوترا ئیتر نایشکێنێ، بگرە

---

١– المسند للإمام أحمد ١٥٦/١، مسند أبي يعلى ٢٥٨/١.

٢– البخاري، الجهاد، ٥٢، مسلم، الجهاد، ٧٨– ٨٠، الترمزي، الجهاد، ١٥.

"رۆژوی ویسالْ"ی دەگرت، واتە: چەند ڕۆژێك بەسەر یەكەوە بەرۆژوو دەبوو و نەی دەشكاند.هەندێ جار هەموو شەوی بە شەونوێژ زیندوو دەكردەوە، تا پێی موبارەكی بوو بوون بە برین، حەزرەتی عائیشە (خوای لێی ڕازی بێت) پێی فەرمو: ئەی پێغەمەری خوا بۆ ئاوا لەخۆت دەكەیت! خۆ خودا لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخرت خۆش بووە؟ پێغەمبەریش ﷺ پێی دەفەرمو: ئایا بەندەیەكی سوپاس گوزار نەبم؟![1] كاتێكیش لە "ئەشكەوتی ثەور" بوون، بێ ترس بوو لە مارو مێروو، ئەو كاتەش كە موشریكەكان هاتنە بەر دەرگای ئەشكەوتەكە، حەزرەتی ئەبوبەكر ئارامی لێ بڕا لە ترسی ئەوەی نەوەك یەكێك پێیان بزانێ، پێغەمبەر ﷺ لەو پەڕی دڵئارامی و سەكینەتدا پێی فەرموو: ئەی ئەبوبەكر چی دەڵێی كە دوو كەس هەبن خودا سێیەمیان بێت، خەمت نەبێ خوامان لەگەڵە.[2]

ئەو مرۆڤەی كە بە هیچ جۆرێك ترس ناناسێت، كاتێك كە گوێبیستی قورئان دەبێت دڵی نەرم دەبێت و هۆناوی ئەسرین بە چاوانیدا دێتە خوارێ و، خەریكە هەناسەی لێ ببڕێ، (عبدالله‌ی كوڕی مەسعود (خوای لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموم: قورئانم بۆ بخوێنە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانت بەسەردا بخوێنم و بۆ سەر دڵی تۆ دابەزیوە ! فەرمووی: بەڵێ، من پێم خۆشە لە

---

١- البخاري، التهجد، ٦، المسلم، المنافقون،٧٩-٨١، الترمزي، الصلاة،١٧٨.

٢- مسلم، فضائل الصحابة، ١، الترمزي، تفسير سورة التوبة(٩) ١، المسند، للإمام أحمد ٤/١ .

کەسێکی تـرەوە ببیبیستم، منـیش سـورەتی(النسـاء)م بـۆ خوێنـد تـا گەیشتمە ئەم ئایەتە: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾ النسـاء: ٤١، واتـە: (ئـەبێ حـاڵی ئـەو کافرانـە، لـە جولەکەو لەگاور و غەیری ئەوان، چۆن بێ کە لەرۆژی قیامەتـدا شـاهدێ لەسەر هەر ئوممەتێ بێنین، واتە کـە پێغەمبەرەکـەیان شـایەتی لەسـەر بـێ بـاوەڕی و کـردەوەی خراپـی کافرەکـان بـدات و تـۆیش بێـنین بۆشاهیدی لەسەر راستی قسـەی پێغەمبـەرەکانیان ؟) فـەرموی لێـرەدا بوەستە، مەڕۆ، روانیم چاوەکانی فرمێسك دەڕێژن)[1].

ئەو مرۆڤی دڵ زیندو و ویژدان هۆشیارە، هەمیشە لـە پێشـبڕکێ و جیهادی ماددی و مەعنەویدا پێشەنگە، کاتێك ئوممەتەکەی هەڵدەنێ بۆ تەوبە و ئیستغفار، خۆی لە ریزی پێشەوەیە کە دەفەرموێ: (سوێند بـە خوا من لە رۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار تۆبە و ئیستیغفار دەکـەم)[2] ئـای ئـەم وتەیـە چـەندە گـەورە و بـەرزە ! کـە بـۆ بیرکردنـەوە و تێڕامـان هانماندەدات. ئەوەی لـە جیهـادی گـەورەدا سـەرکەوتو بـوو ئـەکرێ بـۆ جیهـادی بچوکیشـی بڕوانـرێ و، بێگومـان سەرکەوتنیشـی مسـۆگەرە، بەڵام مەگەر بە دەگمەن، دەنا کەسێك نەبینراوە لـە جیهـادی گـەورەدا

---

١- البخاري، تفسير سورة(النساء:٤) ٩، المسند للإمام أحمد ١/ ٤٣٣، دلائل النبوة للبيهقي، ١٠/ ٢٣١.

٢- البخاري، الدعوات، ٣، الترمزي، تفسير سورة محمد(٤٧) ١، ابن ماجه، الأدب، ٥٧، المسند للإمام أحمد ٢/ ٢٨٢.

دۆڕاو بێت و لە جیهادی بچوکدا سەرکەوێت. بۆیە ئەوانە هەرگیز ناتوانن بگەنە ئامانج با مەودایەکیشیان لەو ڕێگایەدا بڕیبێت.

عبداللهی کوڕی عومەر (خوا لێیان رازی بێت) بە حەزرەتی عائیشە (خوای لێی ڕازی بێت) دەڵێ: ئاگادارمان بکە لە سەرنج ڕاکێشترینی شتێك کە لە پێغەمبەرەوەﷺ بینیبێتت؟ ئەویش دەستی بە گریان کردو وتی: هەموو شتێکی سەرنج ڕاکێش و سەرسامی بوو، لە سەرە شەوی خۆمدا بوو تا پێستی بەر پێستم کەوت، پاشان فەرموی ڕێم دەدەی کە پەروەردگارم بپەرستم (چەند بە لوتف و نیانە داوای مۆڵەت لە خێزانەکەی دەکات بۆ ئەوەی خوا بپەرستێ) دەڵێ: وتم سوێند بە خوا من حەزم لە نزیکی تۆیە وحەزیش دەکەم پەروەردگارت بپەرستیت. هەستا چوو بۆ لای گۆزەکەو دەست نوێژی شۆردو ئاوی زۆری نەڕژاند. پاشان دەستی کردە نوێژ کردن، دەستی بە گریان کرد هەتا ڕیشی موبارەکی تەڕ بوو، پاشان سوجدەی بردو گریا هەتا زەویەکەی تەڕ کرد، پاشان لەسەر لا ڕاکشا و بەردەوام دەگریا، تا بیلال هات و مۆڵەتی خواست تا بانگی بەیانی بدات، بیلال وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆدەگریت!؟ کە خوا لە گوناهی سەرەتا و کۆتات خۆش بووە ! پێغەمبەرﷺ فەرموی: بیلال بۆ وا دەڵێیت چی هەیە بەر لە گریانم بگرێت؟ کە ئەم شەو ئەم ئایەتەم بۆدابەزیوە: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٩٠، واتە: (بێگومان لە دروستکردنی ئاسمانەکان و ئەرز و یەك بەدوای یەکی

هاتنی شەوو ڕۆژدا چەند دەلیل و نیشانەی ئاشکرا هەیە بۆ ئەوانەی خاوەن فام و هۆشن، دەلالەت ئەکەن لەگەورەیی و دەستەڵاتی خودا و، لەوەی کە یەکەو هاوبەشی نی یە...)، پاشان فەرموی: ( وەیل و تیاچوون بۆ ئەو کەسەی کە ئەم ئایەتە دەخوێنێت و بیری لێ ناکاتەوە).[1]

هەندێك جار پێغەمبەرﷺ بۆ نوێژ هەڵدەستا بێ ئەوەی خێزانەکەی بە ئاگا بێنێ، دەست نوێژی دەشۆرد و بۆ پەرستنی پەروەردگاری رادەوەستا. دایکمان حەزرەتی عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: گوێم لێ بوو دوعای دەکرد و دەی فەرموو: ( پەروەردگارا، پەنا بە ڕەزامەندیت دەگرم لە توڕە بوونت. پەنا دەگرم بە لێخۆش بوون و لێبوردەییت لە سزاو تۆڵەت، پەنا دەگرم بە تۆ لە خۆت(واتە بە لوتف و بەخشینت لە قەهر و توڕەییت ، لە گەورەیی و جەلالت بە جوانی جەمالت، لە جەبەروت و هێزت بە بەخشندەیی و میهرەبانیەکەت)، ناتوانم وەك پێویست سوپاسی تۆ بکەم، تۆ ئەو خوایەیت کە خۆت ستایش وسەنای خۆتت کردوە) ئا ئەوە پێغەمبەری خۆشەویستەﷺ و ئەوە جیهادە مەزنەکەیەتی و ئەوەش گەورەیی و بڵندیەتی.

---

١- صحيح ابن حبان، ٢/٣٨٦، الجامع لأحكام القرآن للقرطبي، ٤/ ٣١٠، تفسير القرآن العظيم لابن كثير ٢/١٦٤.

## د- ئەوانەی شوێنی کەوتن

هاوەڵە بەڕێزەکان (خوایان لێ ڕازی بێت) زۆر بە جوانی هەنگاو بە هەنگاو هەوڵیان دەدا بۆ شوێن کەوتنی پێغەمبەرﷺ، هەرچی لە توانایاندا بوو خستیانە گەڕ تاوەکو ژیانیان بەو شێوازە بەسەر بەرن کە پێغەمبەرﷺ بەسەری دەبرد، چونکە ئەوان باش دەیانزانی کە هاوڕێیەتی ئەو لە دواڕۆژدا کاتێك بەدەست دێ کە لەم دنیادا بە تەواوەتی و بەجوانی شوێن پێی ئەو هەڵبگرن. ئەوان کەسانی وەك (ثوبان)یان تێدا بووکە ڕۆژێك جیابوونەوە و فیراقی پێغەمبەریﷺبە بیردا هات، ئیتر خەم و خەفەت داباری بەسەریدا. لە یەکێك لە جەنگ و غەزاکاندا لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ دەرنەچوو بوو، لە ساتەوەختی گەڕانەوەیدا یەك لە دوای یەك هەموو دەچوونە خزمەتی، (ثوبان) یش یەکێك بوو لەوانەی کە چوونە خزمەتی، بەڵام ڕەنگی زەردو لەش و لاری زۆر لاواز بوو بوو، بە جۆرێك کە تەنها ئێسك و پێستی مابوونەوە، پێغەمبەری سۆزو بەزەییﷺ لێی پرسی: ئەمە چیە (ثوبان)؟

ئەویش وتی: بیرم لە شتێك کردەوە وام بەسەرهات، لە دەروونمدا وتم: من ناتوانم سێ ڕۆژ بەرگەی دووری پێغەمبەرﷺ بگرم، ئەی چۆن ئەتوانم لە جیهانی نەمریدا لێی دوور بم، چونکە ئەو لە پلە و پایەیەکی بەرزدایە و لە بەهەشتی تایبەتی خۆیدایە، منیش کەسێکم لە عاممەی خەڵك، ئەگەر بچمە بەهەشتیشەوە ناتوانم بچمە بەهەشتە تایبەتیەکەی ئەو، واتە من بۆ هەمیشە لەو بە دوور دەبم و جیا دەبمەوە. ئەی

پێغەمبەری خواﷺ بیرم لەمە کردەوە و کەوتمە ئەم بارو دۆخەوە، پێغەمبەریشﷺ ئەم وەڵامە شیفا بەخش و نەمرەی دایەوە کە فەرموی: (المرء مع من أحب)[١] (مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدایە کە خۆشی دەوێت).

بێگومان کەسێك یەکێکی خۆش بوێت بەوە دەبێ کە چاوی لێبکات و خۆی وەك ئەو بچوێنێت و، ژیانیشی بکاتە هاو وێنەی ژیانی خۆشەویستەکەی و شوێن پێی هەڵبگرێ، هاوەڵە بەڕێزەکانیش بە تەواوەتی بەم هەستەوە دەژیان.

نمونەیەکی تر: حەزرەتی جابیر (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ چوینە دەرەوە، مەبەست لە غەزای (ذات الرقاع)ە، ژنی پیاوێکی موشریك پێکرا، پیاوەکەش سوێندی خوارد واز ناهێنم تا خوێنی یەکێك لە هاوەڵانی محەممەد نەڕێژم، کابرا بە مەبەستی تۆڵە دوایان کەوت، پێغەمبەرﷺ لایدایە شوێنێك و، فەرموی: کێ ئێشکمان دەگرێ؟ پیاوێکی موهاجیری و یەکێکی ئەنصاری ئەو ئەرکەیان گرتە ئەستۆ، پێی فەرمون: لە دەمی دۆڵەکەدا ئێشك بگرن، کاتێك دوو ئێشك گرەکە چون بۆ دەمی دۆڵەکە ئەنصاریەکە بە کۆچەریەکەی وت: سەرەتای شەوت پێخۆشە ئێشك بگرم یان کۆتایی ، وتی: سەرەتا، کۆچەریەکە ڕاکشا، ئەنصاریەکە هەستاو دەستی بە نوێژ کرد، کابرای دوژمن هاتو کاتێك بینی یەکێك لە ئێشك گرەکان نوێژ دەکات تیرێکی تێگرتو پێکای، نوێژەکەی نەبڕی و تیرکەی لە جەستەی دەرکرد، بەم

---

١- مسلم، البر، ١٦٥، الترمزي، الزهد، ٥٠، المسند للإمام أحمد ٣٩٢/١.

شێوە تا سێ تیری تێگرت پاشان چەمیەوە و چووە رکوع و سوجدەی برد، پاشان هاورێکەی بەئاگا هێنا. کاتێ کابرای دوژمن بۆی دەرکەوت پێیان زانیوە هەڵهات، کاتێك کۆچەریەکە ئەو خوێنەی بینی بە ئەنصاریەکەوە، وتی: (سبحان الله) پاكو بێ گەردی بۆ خوا ! بۆچ لە یەکەم تیردا بە ئاگات نەهێنام؟ وتی: سورەتێکم دەخوێندەوە پێمخۆش نەبوو بیبڕم![1] بەو مانایەی نوقمی دڵئارامی و سەکینەت بوو بوو، وەك ئەوەی قورئان دابەزێتە سەری و ئەویش لە نوێژدا بیخوێنێتەوە... یاخود حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێ) هاتبێ‌و هەناسەی خۆی بە بەردا کردبێ، ئیتر خۆشی‌و سۆزی حاڵ گرتبێتی‌و وای لێهاتبێ کەهەست نەکات بە ئێش‌و ئازاری ئەو تیرانە، ئەمە هەڵویستی کەسێکە کە "هەردوو جیهادەکە" گەورە و بچووکی کۆکردبێتەوە، بەڵکو ئەمە ڕووی حەقیقەت و ڕاستی جیهادە.

حەفصەی کچی حەزرەتی عومەر(خوا لێیان ڕازی بێت) بە باوکی وت: بابە گیان خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی بۆ فراوان کردویت و وڵاتانی بۆفەتحکردویت و، خێرو خۆشی زۆر کردووە ئەگەر خواردنێکی نەرمترت بخواردایە و جلێکی ناسکترت لەبەرکردایە؟ فەرموی: ئەتدەمە دەست خۆت و خۆت دادوەربە، ئایا بیرت چوویەوە پێغەمبەرﷺ ژیانی چۆن بە سەختی گوزەراند، ئەوەندەی دووبارە کردەوە هەتا گریاندی پاشان

---

١- المسند للإمام أحمد ٤/٩٠، دلائل النبوة للبيهقي، ٣/٣٧٨- ٣٧٩، حياة الصحابة للكاندهلوي ١/٤٨١-٤٨٢ أبو داود، الطهارة، ٧٨.

فەرموی: من جارێکی تر پێم وتی سوێند بە خوا ئەگەر بتوانم هاوەڵیان دەبم لەم ژیانە سەختەیاندا (واتە پێغەمبەرﷺ و حەزرەتی ئەبوبەکر) بەڵکو لە ژیانی پڕخۆشی و کامەرانیاندا بەخزمەتیان بگەم. ئەمە بوو ڕێگەی پێغەمبەری خواو هاوەڵە بەڕێزەکان.

ئەوان بەردەوام لە حزوردا بوون و پەیوەندیەکی پتەو و بەردەوامیان لەگەڵ خوادا هەبوو... پەرستش و زیکرەکانیان ئەوەندە زۆر و قووڵ بوون، ئەوەی دەیدین وای هەستدەکرد کە جگە لە پەرستش و زیکرو یادی خوا هیچ ئیش و کارێکیان نیە، لەگەڵ ئەوەشدا کارو پیشە دنیاییەکانیان بە جوانترین شێوە ئەنجام دەدا.

بەڵێ ئەوان نمونەو پوختە و کاکڵەی ئیخلاص بوون، چونکە هەر کردارێکیان ئەنجام دەدا بە پێی ڕەزامەندی خواو لەبەر ڕەزامەندی خوا بوو، ئەوان هەموو کردارێکیان لە ژێر چاودێریەکی ورد و بەردەوامی خوادا بوو. نمونەی ئیخلاصی گەورەمان حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) لەبەر دەمدایە، کە ڕۆژێك بەبێ هۆ وتارەکەی بڕیو وتی ئەی عومەر تۆ شوانە وشتری باوکت(خەتاب) بووی... لەسەر دوانگەکەی دابەزی، کاتێك پرسیاری لێکرا: چی وایلێکردیت وتارەکەت ببڕیت ؟ لە وەڵامدا وتی: هات بە خەیاڵمدا کە من خەلیفە و جێنشینم !

لە عەروەی کوڕی زوبەیرەوە(خوا لێیان ڕازی بێت): حەزرەتی عومەری کوڕی خەتابم بینی گۆزەیەك ئاوی خستبوە سەر شانی، وتم

ئەی ئـەمیری ئیمانـداران پێویسـت ناكـات تـۆ ئـەوە بكـەیت! فـەرمـوی: نوێنـەرو وەفـدەكان هاتنـە لام گوێبیسـت و گوێڕایـەڵ بـوون، نـەفس و دەرونم هەستی بە شكۆمەندی دەكرد، ویستم نەفسی خۆم بشكێنم.

هـەروەها عومـەری كـوڕی عبـدالعزیز (رەحمـەتی خـوای لێبێـت) لەسەر دوانگە وتاری بڕی كاتێك هەستی كرد كە لە دەرونیـدا شـانازی و لەخۆبایی بونێك پەیدابووە. ڕۆژێك نامەیەكی نوسی و لەوەترسا كـە لـە خۆی بایی بێت و شانازی پێوە بكات دەسبەجێ دڕاندی و وتی: خوایـە پەنات پێدەگرم لە خراپەی دەرونم.

جیهادی ئەو كەسە پاكانەی ڕۆحیـان گەیشـتە پلـەی كـەماڵ و بـە هۆی جیهادەوە كامڵ بوون، بێ بەروبووم نابێ، چـونكە لـە ڕێـی خـوادا بوو. هەر بۆیە ئەوانـەی لێـرە و لـەوێ خۆیـان هەڵدەكێشـن و بـە نـاوی جیهـادەوە شـانازی بەكردەوەكانیانـەوە دەكـەن، هـەروەك كاروبـاری ناوخۆیان چاك و ڕێك و پێك نەكردووە، خۆشـیان لـە ڕیـاو ڕووپامـایی و شـانازی و بـەخۆدانازین و خـۆ بەگـەورەزانین ڕزگـار نـەكردووە، كردەوەكانیـان لـە بـری ئاوەدانكردنـەوە و بنیاتنـان زیـاتر ڕوخانـدن و كاولكاریـە ، ئەمانـە بـا لـە یـەكێك لـە قۆناغەكانیشـدا ئاسـتێكی دیـاری كراویان بڕیبێت هەرگیز بە ئامانج و ئاوات ناگەن.

## هـ- بەدەستهێنانی عینایەت و چاودێری خوا

ئایەت و فەرمودەی زۆر هەن كـە هـەردوو جیهادەكـە پێكـەوە كـۆ دەكەنەوە، بێگومان سورەتی(النصر) لە پێشەنگی ئـەم ئایەتانەدایـە﴿

﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾ ﴾، ئەم سورەتە مزگێنی دەدات بە هاتنی سەرکەوتن لەلایەن خواوەندەوە و لە هەمانکات دا فەتحی مەککەش ، خەڵکیش پۆل پۆل دەچنە ناو دینی خواوە، هەر بەم وەهاش بوو، لە کاتێکدا بەربەست و کۆسپەکان لابران لەبەردەم جیهادی بچوك و فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپەدا و کۆسپەکان لە بەردەم تەبلیغی حەقدا لادران، خەڵکیش بە کۆمەڵ چوونە ناو دینی خواوە، ئا لەم قۆناغەدا فەرمانی خوایی ئەوەیە: ﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ ﴾النصر: ٣، چونکە هەموو ئەم کارانە تەنها و تەنها ئیحسان و نیعمەتی خوایین و هیچی تر، چونکە هەر خوا خۆی هەموویانی بەدی هێناوە، پێویستە لەسەر ئەو مرۆڤەی کە لەدەرەوەدا بەسەر دوژمنەکانیدا سەرکەوتوە، بۆ ئەوەی جیهادەکەی کامڵ بێت دەبێ لە جیهانی ناوخۆشدا بەسەر خۆیدا سەربکەوێت.

لە ڕۆشنایی ئەمەدا دایکمان عائیشە(خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ دوای دابەزینی ئەم سورەتە بەردەوام دەیفەرمو: (سبحان الله و بحمده أستغفرالله و أتوب إليه، سبحانك اللهم أستغفرك و أتوب إليك)[1]. لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ ئەم دوو جیهادە پێکەوە گرێ دەدات و دەفەرموێ: (عينان لاتمسهما النار عين

---

١- مسلم،الصلاة،٢٢٠، المسند للامام أحمد٦/٣٤.

بكت من خشية الله وعين باتت تحرس في سبيل الله)[1] (دوو چاو ئاگريان بەرناكەوێت: چاوێك لەبەر خواو لە ترسی خوا گريا بێتو، چاوێك لەبەر خوا ئێشكی گرتبێت).

بەڵێ جیهادی کەسێك کە لەسەر سنور و سەنگەرەکاندا و لەمەیدانی جەنگدا و لە ترسناکترین پێگەکانی جیهادی مادیدا ئێشك دەگرێ ، ئەوەی ئەم جیهادە جێبەجێ دەکات چاوانی لە ئاگر بە دوورن، چاوێکی تریش کە جیهادی مەعنەوی گەورە جێبەجێ دەکات، ئەو چاوەیە، لە ترسو خەشیەی خوادا گریابێت، ئەم دوو چاوە لەم مزگێنی یە هەتا هەتایەدا هەردووکیان یەکسانن، لەوەدا کە ئاگریان بەرناکەوێت. بەڵێ، بەپێی مهرو ڕەحمەتی خواوەند ئەستەمە ئەم دوو چاوە ئاگریان بەربکەوێت وەك ئەستەمیی گەڕانەوەی شیر بۆ ناو گوان! ئەوکەسەش کە لە پێناوی خوادا تۆز و غوباری لێدەنیشێت هەر بە هەمان شێوەیە ، لە فەرمودەی زۆردا پێغەمبەری ئەکرەمﷺ مژدەی داوە کە ئاگر و ئەو تەپ وتۆزەی کە لە ڕێی خوادا لە کەسێك نیشتبێت پێکەوە لە مرۆڤێکدا کۆنابنەوە.

بەڵێ، ئاگر بەر ئەو چاوانە ناکەوێ کە لە ترس و شەرمی خوا ئەسرینی گەرم دەڕێژن، هەروەها ئێشك دەگرن و پاسەوانی ئەو کون و کەلەبەرانە دەکەن کە مەترسی هاتنە ژوورەوەی دوژمنانی لێوە دەکرێت. ئەو کەسەی خۆی تەرخان دەکات بۆ ئەم کارانە و بەرەنگاری

---

١- الترمذي فضائل الجهاد،١٢،كنز العمال للهندي،١٤١/٣.

ئەو مەترسیانە دەبێتەوە کە چاویان لە وڵات بڕیوە و لە بەردەمیاندا دەوەستێت، ئەویش بە بنیاتنانی ئەو دامەزراوانەی کە پەروەردەی ڕۆڵەی ئوممەتەکەی تێدا دەکرێت لە ئاستێکداکە شیاوی مرۆڤ بێت، خۆیشی بەدوور بگرێت لە حەز و ئارەزوەکانی دەرونی لە پێناو خەڵکی تردا و بایەخ بە پشووی خەڵکی و خۆشی گوزەرانیان بدات..ئەوانە چاویان ئاگری بەر ناکەوێ. هەر لەم سۆنگەوە ئەوانەی وادەبینن کە جیهاد لێرە و لەوێ دەمە دەمە و موناقەشەیەکە گەر چاودێری کردەوەکانیان نەکەن و بەکێشانە و پێوانەی ئەو جیهادەی بانگەشەی بۆ دەکەن کردەوەکانیان نەپێون، ئەوانە بێجگە لە بەفیڕۆدانی کات و خۆ خەڵەتاندن هیچ شتێك ناکەن. ئەوانەی کاریان لەگەڵ نەفسی خۆیاندا یەکلایی نەکردوەتەوە و بە چاودێری بەردەوام دەروونی خۆیان جڵەونەکردوە و، لوتی ڕوپاماییان نەشکاندوە و گیانی شانازیان لە ژێر پێیاندا وردوخاش نەکردوە و، لە ناو ڕۆحیاندا خۆ بەگەورە زانین و خۆدەرخستنیان لە ڕیشکەوە دەرنەهێناوە...کارەکانیان هیچ سودێکی نابێ، تەنها ئەوە نەبێ کە دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ نائارامی و پشێوی.

لە لایەکی ترەوە ئەوانەی لە مەیداندا پاشەکشە دەکەن و، خۆیان تەریك کردووە و بەشی خۆیان تەنها لە جیهادی مەعنەویدا وەرگرتووە و دەڵێن: ناگونجێ خەریکی چاککردنی خەڵك بیت هەتا جیهادی نەفسی خۆت تەواو دەکەی... ئەوانەی وا دەبینن کە چەند پلە و پایەیەکی مەعنەوییان بۆ خۆیان بە دەست هێناوە و، لایان وایە گەیشتن بە پلە و

پایە بڵندەکان لە سەرووی هەموو کارێکەوەیە و، لە ڕێنمونی خەڵکی خۆیان دەدزنەوە، ئەوانە لە هەڵەیەکی دیار وئاشکرادان چونکە ئیسلامیان تێکەڵ بە ڕۆحانەتی سۆفیەتی(میستیزم) کردووە.

ئەو بیرۆکەیەی کە زاڵە بەسەر ئەوانەی دەڵێن ئەبێ خۆت کامڵ بکەیت، پێش ئەوەی خەڵکی تر بانگ بکەیت و، تەنها بە لایەنی جیهادی مەعنەوی وازدێنن. ئەوەی دەڵێن: هەموو مرۆڤێك بەتەنها لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت، وەکو پێشینان دەڵێن " بزن و مەڕ بەلاقی خۆی هەڵدەواسرێت" ئەوەی دەڵێت یەکێك خۆی چاك نەکردبێت ناتەواناترە کەسانی تر چاك بکات، بۆیە پێویستە مرۆڤ لە پێشدا ئاوڕ لەخۆی بداتەوە ..

ئێمەش بەو کەسەی نوقمی ئەم بیرۆکەیە بووە دەڵێین: بزانە مرۆڤ هەر کاتێك وای هەست کرد خۆی ڕزگار کردوە، دەست بەجێ دەکەوێتە ناو ترسناکترین گێژاوەوە، کێ دەتوانێ لافی ئەوە لێبدات کە خۆی ڕزگار و سەرفراز کردووە لە کاتێکدا قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴿٩٩﴾ ﴾ الحجر: ٩٩. بەڵێ، مرۆڤ هەتا کۆتا هەناسەکانی ژیانی فەرمانبەردارە بە بەندەگی و پەرستش، ناتوانێ واز لە کارێك بهێنێت بە مانای بەندایەتی خواوەند تا پەردە لادەدرێت و بانگ دەکرێت بۆ جیهانەکەی تر. ئیتر چۆن دەگونجێ کەسێك بەم شێوەیە تەکلیفی لەسەربێت و بڵێت: نەفسی خۆمم ڕزگار کردووە، بەو مانایە کە جیهادی مرۆڤ لەگەڵ دەروونیدا و هەوڵ وکۆششی بۆ

پاكژكردنـەوە و پاڵفتـەكردنی لـە خوڕەوشـتە نـزم و نەشـیاوەكان و، هەوڵدان بۆ چاككردن و ڕاستكردنەوەی دەرون تا ژیان بـەردەوام بێت ئەویش بەردەوام دەبێت.

كەواتە ئێمـە ناچارین هەمیشـە لـە نێوان تـرس و ئومێد(الخوف والرجاء) دا بژین، هەروەك چۆن كەسی ئیماندار لە ئەنجام دڵنیا نابێت هـەروەها بـێ ئومێدیش ڕووی تێناكـات، بـەڵام دەبێت لـە دنیـادا تـای تـەرازوی تـرس قورسـتر بێـت. سـەرنجی حـاڵی گـەورەمان حـەزرەتی عومـەری كـوڕی خـەتتاب (خـوا لێـی ڕازی بێـت) بـدەن كـە لـە كۆتـا هەناسەكانی ژیانیدایە لە ترسی لێ پرسینەوە و حیساب دڵـە تەپێیـەتی ، ئـەم تـرس و دڵـە تەپێیـەی كـەمی نـەكرد تـا عەبـدوالله ی كـوڕی عەباس(خوا لێیان ڕازی بێت) مزگێنـی پێـداو وتـی: لـە ڕۆژی قیامەتـدا شایەتیت بۆ دەدەم كە تۆ چاكەكاری[1]. بەڵێ ئایا قورئانی پیرۆز بیرمـان ناخاتـــەوە بـــە: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ﴾ الـــرحمن: ٤٦. واتـــە: (بۆهەركەسێكیش لەپەروەردگاری ترساوە دوو بەهەشت هەیە).

## و- تێگەشتنی پێشینان (السلف)

هـیچ كـام لـە ڕابـەرو مورشـیدە ڕاسـتەقینە مەزنـەكان، ئەوانـەی ئیسلام پەروەردەی كردن وا تێنەگەیشتون كە جیهاد تەنها بریتـی بێت لە یـەكێك لـەو دوو ڕووە. با لـەودیو شیشـی ئاسـنی بەندیخانەكانیشدا

---

١- الطبقات الكبرى، لإبن سعد ٣/٣٥٢.

بووین. هەرگیز دواش نەکەوتوون لە بڵاو کردنەوە و ئاشکراکردنی حەق و ڕاستی، هەروەها ئەو پەیوەندیە توند و تۆڵەی لەگەڵ پەروەردگاریان هەیانبوو سست و خاویان نەدەکردەوە، با مەیدانی ئیش کردنیشیان لەوپەڕی فراوانیدا بووبێت بە هیچ جۆرێ بازنەی دڵیان فەرامۆش نەدەکرد. بەڵکو ئەوەی لەو بوارەدا بەسەریاندا دەڕژا بووە بەشێك لە کامڵبوونی مەعریفە و عیرفانیان ، ئیتر هەمیشە ساتە وەختەکانیان بە هەست و ئیحسانی خواوەندەوە بەسەر دەبرد و، هەموو ساتێ چاودێری خوایان لەبەر چاو بوو و بەم کارەشیان خۆیان لە خوای باڵادەست نزیك دەکردەوە. هەتا پەروەردگار(جل جلالە) بووە ئەو چاوەی کە پێی دەبینن و ئەو دەستەی کە دەیوەشێنن .. خوای پەروەردگار پیت و بەرەکەتی باراند بەسەریانداو هەر تاکێکیان بوو بە هەزاران کەس.

## ز- مرۆڤی ئەمڕۆمان چی لەسەر پێویستە؟

ئەگەر مرۆڤ لەم کات و ساتەدا بیەوێت لە ڕێگەی خوادا جیهادێکی ڕاست و تەواو بکات بەو جۆرەی لای خوا پەسەندەو پێی رازی یە – وەکو لەسەری پێویستە – دەبێ چاودێریەکی وردی دەروونی خۆی بکات و لێ پرسینەوەیەکی سەخت و دژوار لەگەڵ ئارەزوەکانیدا ئەنجام بدات، هاوکات هەستێ بە بڵاوکردنەوەی حەق و ڕاستی و گەیاندنی بە خەڵکانی تر، گەرنا ئەگەرێکی بەهێز هەیە کە خۆی بخەڵەتێنێت، ئیدی نە خۆی کەڵك لە کارەکانی وەردەگرێ و نە کەسی تر. موجاهید ئەبێ ئەوەندە ئیخلاصی هەڵگرتبێت وای لێ بکات بەسەر هەموو شتێکدا(خوا

هەڵبــژێری)، موجاهیــد مرۆڤێکــی خــاوێن و دڵســۆز و خــاوەن دڵێکــی زیندووە، بـەم جـۆرە جیهـاد بـەردار و بـەردەوام دەبێـت. ئـەو لـە بـری ئـەوەی عـەقڵی خـەڵکی بـە کۆمـای زانیـاری بـاش و خـراپ پـڕ بکـات، پێویستە لەسەری ئیخلاص( بۆ خـوا بـوون)و نیـەت پـاکی‌و، ڕۆحـی لـێ پرسینەوە و، موحاسەبەی خود لە دڵ وعەقڵی خەڵکیدا جێگر بکـات و، وایان لێ بکات ببنە پیاوی دڵ .

بەڵێ جیهاد هاوکێشەیەکی هاوسەنگە لە نێوان فەتح کردنی نـاخی مـرۆڤ و دەرەوەیـدا، هـەر لـە ڕێی جیهـادەوە مـرۆڤ دەگاتـە کـەماڵ و خەڵکی تری بۆ بانگهێشت دەکات. گەیاندنی مرۆڤ بۆ ناخی خۆی ئـەوە جیهادی گەورەیە و، بردنی خەڵکی تـر بـەرەو کـەماڵ جیهـادی بچوکە. ئەگـەر ئـەم دوو جیهـادە لـە یـەکتر جیابکرێنـەوە ئـەوە مانـای جیهـاد لەکاردەخرێت، بە یەکێکیان سەرکزی و داماوی و، ئەوی تریـان تونـد و تیژی و ئیرهاب لە دایك دەبێت. ئێمە چـاوەڕێی لـە دایـك بـوونی ڕۆحـی محەممەدی دەکەین، ئەمەش نایەتەدی بە شـوێن کـەوتنی پێغەمبـەرﷺ نەبێت لەم کارە و لە گشت کارێکدا. چەندە بەختەوەرن ئـەو کەسـانەی کە هەروەك چۆن بەشوێن هۆکارەکانی ڕزگـاربوونی خۆیانـدا دەگـەڕێن، ئـاواش بــە شــوێن هۆکارەکــانی ڕزگــارکردنی خــەڵکیش دا دەگــەڕێن! ئەوانەش چەندە بەختەوەرن لە کاتی سەر قاڵ بـوون بـە ڕزگـار کردنـی کەسانی تردا خۆیان لە بیر ناکەن.

جیهاد بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت، چونکە هەرچەندە هەوڵ و کۆشش لە پێناو ڕزگار کردنی مرۆڤایەتیدا بکەین بێگومان چەندین بێباوەڕ هەر دەبن کە پێداگری بکەن لەسەر کوفر و بێباوەڕیان، ئەمەش مانای بەردەوام بوونی جیهاد دەگەیێنێت، خۆ ئێمە فەرمانبەردارین بە ناساندنی پەروەردگاری بەرزو بڵندمان بە هەموو خەڵکی، ئەگەر کەسێك ڕێگەی لێ گرتین و بوە بەربەست لەڕێگەی گەیاندن و تەبلیغداو، دەیویست لە ئەرك‌و کاری خۆمان لامان بدات، لەو ئەرکە خالیص‌و پاك‌و بێگەردەی خراوەتە ئەستۆمان، ئیدی چار نی یە ئەبێ پەنا ببرێتە بەر جیهادی ماددی، ئێمە ناچارین لە هەردوو جیهادە ماددی و مەعنەویەکەدا هەوڵی سەرکەوتن بدەین، چونکە ئەگەر وا نەکەین وەك مرۆڤ مافی ژیان و داواکاریەکانی لە دەست دەدەین.لە کاتێکدا"خاچ پەرستان" ویستیان ببنە بەربەست بۆ ئەو چەمکە مرۆڤانەیەی کە باوباپیرانمان هەڵگری بوون، لەو کاتەدا باپیرانمان بۆ ئەم مەبەستە ژیانیان کردە قوربانی، بینیان لابردنی ئەو بەربەستانە بە ئامادەکردنی هێز و توانا دەبێت ، ئەمەش واتا و ناوەڕۆکی ئەو جەنگانەیە کە پێی هەستاون ..

حاشا لەوەی ئەوان جگە لە تەبلیغ هیچ مەبەستێکی تریان بووبێت، حاشا لەوەش کە خۆشەویستی دەستەڵاتداری و داگیرکاری لای ئەوان پاڵنەر بووبێت .. بەڵکو ئەوان عەشقی(بەرزکردنەوەی وشەی الله) بوون، ئەوان هیچ شتێکیان لا گرنگ نەبوو جگە لە گەیاندی

حەقیقەتی"لاإله إلاّ الله" بە گشت لایەکی سەر زەوی، تا لەسـەر زەویـدا خالێکی ڕەش نەمێنێت بە نووری ئیمان ڕووناك نەبوبێتەوە. هـەر وەك بلێیت ئەوان بەسەر منارەکانەوە بوون بە بانگدەری زەمانـەی خۆیـان ، دەنگیان بە بانگ بلنـد کردبـێ و ئیمانیـان لەسـەر هـەموو گۆی زەویـدا ئاشکرا کردبێ. بەلێ وشەی "لاإله إلاّ الله" بوو لـە ئاسـۆکاندا بـە زمـانی سوپاو دەنگی چەکەکانیان لە منارەکانی ئەم ئوممەتەدا دەنگی دایـەوە ، ڕۆژێك لە ڕۆژان لای ئێمە حەز لە داگیر کـردن و دەسـت گـرتن بەسـەر گـەل و نەتـەوەکانی تـردا نەبووەتـە ئامـانج. ئـەو بانگـەی سـولتان محەممەدی فاتیح و هاو وێنـەکانی لـە منارەکـانی دەولـەتی عوسمانیـدا بەرزیان کردەوە و لە دوورترین تاریکیـەکانی جیهانـدا دەنگـی دایـەوە و بە "لاإلـه إلاّ الله" ڕوونـاکی کـردەوە، بگـرە ئێمـە ئەوانـە دەبیینـین کـە وەلامی ئەو بانگەیان دایەوە و، ئەو بانگـەوازە بلنـدەیان لـە مەیـدانێکی زۆر فراواندا پێگەیشت ،کە لە دارسـتانەکانی(شـاری بـەلگراد)ەوە درێـژ بوەتەوە بۆ چیا سەرکەشەکانی(هیمالایا)، بەلکو ئـەو زایەلـە لەشـەپۆلی زەریا سەرکەشەکاندا دێتە گوێمان.

بەلێ جیهاد بەردەوامـە تـا ڕۆژی قیامـەت، بـۆ ڕوونـاك کردنـەوەی هەموو کونجوڕێکی تاریك و، هەلگرتنی نـووری نـاوی ڕەسـول اللهﷺ بـۆ هەموو شوێنێك و، ڕوناك کردنـەوەی هـەموو لایـەکی جیهـان بـە نـووری قورئـان، لەمـەودواش ئیمانـداران جیهـادی مـاددی بـەڕێوە دەبـەن بـۆ

ئەوەی ڕۆڵی خۆیان ببینن لە هاوسەنگی نێو نەتەوە و دەوڵەتەکاندا، بۆ ئەوەی ناوی ئوممەتی میانڕەو(الأمة الوسط)یان دەست بکەوێ.

ئێمە وەکو ئوممەتێك بە دەست هێنانی ئەو پێگە بڵندەمان خراوەتە ئەستۆ... ئەوەش تاکە ئامانجمانە و هیچی تر، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ البقرة: ١٤٣، بەمانای: ئێمە ئێوەمان کردوە بە ناو بژیوان لەوەی کە ڕوو دەدات لە نێوان دەوڵەتەکاندا و، ڕەگەزی هاوسەنگی لە نێوان ئوممەت و نەتەوەکاندا و، هەروەها بۆ شاهیدی ئیستیقامەت ..خوای گەورەو موتەعال بانگمان دەکات بۆئەوەی بەرز بینەوە و سەرکەوین بۆ لوتکەی هیمالایاو، بگەینە بەرزایەکانی حیرا(حراء) تا هاوبەشی ئەو هەستە بکەین کە پێغەمبەرﷺ هەستی پێ دەکرد، بانگمان دەکات بۆ کامڵ بوونی خود و ئەو فیترەتەی کە پێمان بەخشراوە، ئێمەش یان ئەوەیە عەزمی خۆمان نوێ بکەینەوە بۆئەوەی سەرکەوینە سەر ئەو لوتکەیە، یان پاڵ بدەینەوە و ڕازی بین بەو بارە نالەبارەی کە تێیداین و گلۆر ببینەوە بۆ(أسفل السافلین)و ، لە ژێر پێیاندا ورد و خاش ببین .

# بەشی دووەم

# ئەرکەکانی جیهاد

## ١- جیهاد کاری پێغەمبەرانە(سەلامی خوایان لێبێت)

ئەوکەسەی جیهاد دەکات لە ڕێگەی خوادا و بە پیادەکردنی بانگەوازەکەی دەیەوێت بەڕەزامەندی پەروەردگاری بگات ، وەك کەسێکی ئاسایی لە ئاستی خەڵکی تردا سەیر ناکرێ، چونکە ئەو ئامانج و مەبەستە پیادە دەکات کە پێغەمبەران و نێردراوەکانی خوا – سەلاتو سەلامی خوایان لێ بێت – جێ بەجێی دەکەن و کردویانە بە ئامانجی خۆیان. با ئەمە بە نمونەیەك ڕوون بکەینەوە:

بێگومان هەر مرۆڤێك ڕێگەیەکی تایبەتی و کارێکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەم فەرمانبەرداریەش تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆ نمونە: سەرتاش و دارتاش و کورتاندرو یان خاوەنی هەر کار و پیشەیەکی تر هەر یەکەیان ئامانج و مەبەستێکی دیاری کراوی هەیە و، بار و دۆخی ئێستەی بە پێی ئەو ئامانج و مەبەستە هەڵدەسەنگێنرێت. لە ڕوویەکی ترەوە، هەموو پیشەیەك بە پێی دوور و نزیکی لەو ئامانج و مەبەستەی بۆی دیاری کراوە بایەخ پەیدا دەکات. گرنگی پیشەی

سەرتاشین – لە ڕوویەکەوە خودی سەرتاشەکەش – بە پێی گرنگی ئامانجەکەی هەڵدەسەنگێنرێت. پیشەکانی تریش بەم جۆرە پێوانە بکە، بۆ نمونە: ئەندامی پەرلەمان لە ناو پەرلەماندا یان سەرۆك وەزیران یان سەرۆکی وڵات – ئەگەر سەرۆکایەتی بە کار و پیشە دابنرێت – ئەم پێوانە بەسەر هەر هەموو ئەو کارانەدا جێبەجێ دەبێت، واتە بە پێی ئەو ئامانجەی دیاریکراوە گرنگی بە دەست دێنێت.

کار و پیشەی پێغەمبەرایەتی پاکترین و پیرۆزترین کارە کە خراوەتە ئەستۆی چەند کەسێکی هەڵبژاردە لە نێو خەڵکدا. کارەکەشیان بریتیە لە ناساندنی خوا و ئەو دینەی لە خوای باڵادەستەوە وەریان گرتوە. ئەوان بەم تەبلیغەیان ئەو مرۆڤە فێری ڕێی گەیشتن بە جیهانی نەمری دەکەن و بۆ جیهانی هەتا هەتایی و نیشتەجێبون لە نیشتمانی بەختەوەری و بەرزی و بڵندی بەردەوامدا دەبەن کە لە دلۆپە ئاوێکی قێزەون(نطفة)ەوە دەستی پێکردوە و کە مرد بە لاشەیەکی بۆگەن کۆتایی پێ دێت. بەهێزی ئەو ئیمانەی کە بە مانەوە و بەقا هەیانە و، نزیکیان لە ئەبەدیەت، دڵە ئاتاج و تاسەمەندەکانیان بۆ مانەوە و نەمری ئارام و ئۆقرە دەگرن.

بێگومان ئەو ئامانجەی کە لە ئەرکی پێغەمبەرایەتیدا دانراوە بریتی یە لە ئیمان بە خودا و ناسینی خوای باڵادەست، لە ڕێگەی ئەم ناسین و ئیمانەشەوە پاش گوزەرکردنی لەم دنیایەدا گەیاندنی مرۆڤە بە ڕێگەی نەمری و،گەیشتنی بە خوای گەورە. هەروەها نیشاندانی

جیلوەکانی نەمری و بەقا لەم جیهانە فانییەدا و هەستکردن بە جۆر و ڕەنگەکانی بوون لە ناو فەنادا. تا بیرۆکەکانی بگەیەنێتە ئاستێك کە تیشکی ئەبەدیەتی پێ دەرکەوێ و ئیتر خۆی لە ژێر سێبەری کەوانی سەرکەوتنی "نەمریە مەزنەکەدا" دەبینێتەوە.

پێغەمبەرە بەڕێزەکان ئەرکی پێغەمبەرایەتیان لە ئەستۆ گرتووە و، هەڵدەستن بەپشکوتاندنی تۆوی ئەو گەوهەرەی کە لە ناخ و سروشتی مرۆڤدا چێنراوە، ئەومرۆڤەی کە بۆ نەمری و مانەوە پالێوراو و دەستنیشان کراوە. بەمە پێغەمبەرایەتی دەبێتە پاکترین و پیرۆزترین کار و ئەرك لای خوای گەورە، بە شێوەیەك کەخوای گەورە(سبحانە وتعالى) دوای خوایەتی خۆی، سەرنجەکان بەرەو لای پێغەمبەرایەتی ڕادەکشێ، هەروەها پیرۆزترین کاریش لەم فەرمانبەریە پیرۆزەدا تەنها جیهادە. چونکە جیهاد هۆکار وفاکتەری گەیشتنە بە دوایین خاڵی گرنگ و پیرۆز، کەواتە ئەویش هەر وەك ئەو پاك و بێگەرد و پیرۆزە، ئەوەی قودسیەتی ئەم فەرمانبەردایە پیرۆزە دەردەخات ئەم ئایەتە پیرۆزەیە:

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ﴾ التوبة: ١١١، واتە: (خودا سەرو ماڵی لە موسوڵمانان کڕیوە بەرامبەر ئەوەی بەهەشتیان

پێ بدات، ئەوانە لەڕێگای ڕەزامەندی خوادا ئەجەنگن، کافران ئەکوژن و خۆیان شەهید ئەبن. پەیمانێکیە خودا بەستوویەتی لەگەڵیان، لە تەورات و لە ئینجیل و لە قورئاندا باسکراوە. کێ لە خوا بە وەفاترە بە وەعدەو گفتی خۆی؟ کەواتە ئێوە خۆشحاڵ و شادمان بن بەو موعامەلەی لەگەڵ خوادا کردوتانە . سەرکەوتنی گەورە ئەوەیە).

بە مانای: ئەوانە هەرچیەکیان هەیە لە وجودی ماددی لە نەفس و ماڵ دەیفرۆشن و لە بەرامبەریەوە بە هەشتیان دەست دەکەوێت و ڕەزامەندی خوا مسۆگەر دەکەن. قورئانی پیرۆز بە بەکارهێنانی وشەی کڕین و فرۆشتن پلەو پایەی مرۆڤ بەرز و بڵند دەکاتەوە و دەیگەیەنێتە مەرتەبەی دوێنراو لەگەڵ پەروەردگاری بەرزو شکۆداریدا، کەخوا پەیمان و بەڵێن نامەی لەگەڵدا دەبەستێت. پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا باسی دەکات کە: (هەموو کەسێك کە دەمرێت مۆر و نیشانە لە کردەوەکانی دەدرێت جگە لە موجاهید، چونکە ئەو نەش ونما بە کردەوەکانی دەکرێت هەتا ڕۆژی قیامەت، هەروەها لە فیتنەی گۆڕ ئەمین و پارێزراو دەبێت)[١].

## ٢- جیهاد شایەتیدانە بۆ حەق

بێگومان یەکێك لە ڕووەکانی جیهاد بریتی یە لە ئەرکی شایەتی دان بۆ حەق. هەروەك چۆن - لە دادگاکاندا - گوێ لە گوتەی

---

١- (كلّ المَيّتِ يُختَمُ عَلَى عَمَلِهِ إلاّ المُرَابِطَ، فإنّهُ يَنمُو لهُ عَمَلُهُ إلى يَومِ القيامةِ ويُؤمَّنُ مِنْ فَتّانِ القَبرِ) أبوداود، الجهاد، ١٦، الترمذي، فضائل الجهاد،٢.

شایەتەکان دەگیرێ، بۆ ئەوەی حەق و ڕاستی دەرکەوێ، پاشان بە پێی شایەتیەکان دادگا بڕیار و فەرمانی دەردەکات، موجاهیدەکانیش بە هەمان شێوەن لە کاتی دادگایی کردنیان لەگەڵ بەرەی کوفر و بەریەرەکانێ لەسەر زەویدا، بە هەموو هێزیان بە دەنگی بەرز دەڵێن "خوا هەیە"، بگرە ئەم بانگەوازەیان بە گوێی زەوی و ئاسماندا ئەدەن. ئەم ئایەتە پیرۆزەش ئەم ڕاستییەمان بەڕوونی بۆ دەردەخات کە دەفەرموێ: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلۡعِلۡمِ قَآئِمَۢا بِٱلۡقِسۡطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٨.، بەڵێ، باس کردنی ئەم سێ شایەتی دانە لە یەك شوێنو پێکەوە مانایەکی قووڵی لە خۆ گرتووە، هەروەك لەخوارەوە دەردەکەوێت:

١- زاتی خوا "الله" (سبحانەو تعالی) شایەتی لەسەر بوونی خۆی (جل جلالە) دەدات، کەسە کامڵەکانیش کە گەیشتوونەتە حەقیقەت، ویژدانیان هەستێکی قووڵو ڕەگ داکوتاوی هەیە کە هەست بەم شایەتی دانە دەکەن و، پێنوس ناتوانێ دەری ببڕێت و پەڕاویش ناتوانێ بەیانی بکات.

٢- مەلائیکەتو فریشتەکانیش شایەتی لەسەر بوونی خوا(سبحانە وتعالی) دەدەن، مەلائیکەت لە نورێکی پاڵفتە و پاك دروست کراون، بە شێوەیەك شەیتانیش ناتوانێ کوفرو گومڕایی بباتە ناویان و ئاوێتەیان ببێت، فیترەتیان ڕەسەنە و هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت، ئەوان لە پاکیو بێگەردیدا بەوێنەی ئاوێنەی خاوێن و پاکژن ، لە ماهییەتی پاك

و بێگەردیاندا تەجەلیەکانی خوا(سبحانه وتعالی) دەبینرێن و هەستیان پێ دەکرێت و دانیان پێدا دەنرێت.

٣- زانا گەورە کانیش شایەتی لەسەر بوونی خوا(سبحانه وتعالی) دەدەن، ئەم سێ شایەتی دانە سەرو زیادن بۆ چەسپاندن و بوونی خوا(سبحانه وتعالی) ئەگەر چی هەموو دونیا ئینکاری بوونی خوای گەورە بکات.

بەڵێ، هەر وایە، ئێمە لە ویژدانماندا هەست بەو حەقیقەتە روون و ئاشکرایە دەکەین، بە جۆرێك پێویست بەهیچ بەڵگەیەکی تر ناکات، ئەم شایەتیەیش بۆ سەر نشینانی(مەلەئولئەعلی)[١] بەس و سەرو زیادە.

ئەوانەی کە گوێی خۆیان کەڕ کردووە و چاویان کوێر کردووە و توانای هەست کردنیان بەو هەموو بەڵگانە نیە کە لە بووندا پەرش و بڵاون، ئەو دەنگە زوڵاڵانەش نابیستن و ناشتوانن شوێنەوارەکانی دروست کراوە رەنگینەکانی خواوەند لە گشت ئاسۆکانی سەر زەویدا ببینن ، بۆ ئەمە تەنها ئەم شایەتیەیان بەسە، شایەتیی زاناکان.

موجاهیدەکانیش شایەتی خوان، بە دەنگە زوڵاڵەکەیان لەو دادگایانەدا کە بۆ ملنەدەر و سپڵەکان ساز دەکرێن هاوار دەکەن: ئێمە شایەتی خواین. لە ڕاستیدا ناردنی پێغەمبەرە بەڕێزەکان بۆ ئەوەیە کە ئەم شایەتیە بە جوانترین شێوە ڕابگەیەنن. قورئانی پیرۆز لەم ئایەتەدا ئەم ڕاستی یە ڕوون دەکاتەوە:

---

١- فریشتە بەرزو بڵندە زۆر نزیکەکانی خوای بالادەست.

﴿ رُسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَشْهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ ﴾ النساء: ١٦٥ – ١٦٦، واتە: (ئەم پێغەمبەرانە کە خودای گەورە ناردوونی هەموویان مژدەیان داوە بە خاوەن باوەڕان کەپاداشتیان باش ئەبێ و هەڕەشەیان کردووە لە بێباوەڕان و ترساندونیان بەسزای توند و تیژ لە ڕۆژی قیامەتدا. ئەم پێغەمبەرانە بۆیە بەم حاڵەوە نێرران بۆ لای خەڵك تا لە ڕۆژی دادگایی دا کەحیساب و کیتابیان لەگەڵ ئەکرێ قسەیان لەسەر خودا نەمێنێ و بەهانەیان ببڕێ و نەڵێن ئێمە لە دنیادا کەس ئاگاداری نەکردوین. خودا بەهێزەو کارەکانی پڕ حیکمەتن. بەڵام خودای گەورە شایەتی ئەدا بەوە کە قورئانی بۆ ناردویت و بەزانین و ئاگاداری خۆی ناردوویە بەشێوەیەکی فەصیح و بەلیغ کە کەس نەتوانێ وێنەی بهێنێ و، بەجۆرێك کەقازانجی دین و دنیای خەڵکی تێدا بێ و ئایینی ئیسلام دامەزرێنێ مەلائیکەکانیش شایەتی ئەدەن. بێگومان خودا بەسە بۆ شایەتی و باشترین شاهیدە).

لەگشت نەتەوەیەك لە نەتەوەکان پێغەمبەرێکی بەڕێز هاتووە ڕێگەی بۆ ڕوون کردوونەتەوە، بەڵام کۆتا پێغەمبەر(سیدالکونین والثقلین) ڕەوانە کراوە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بۆ ئەوەی ڕێگای بۆ ڕووناك بکاتەوە، قورئانی پیرۆزیش بەم ئایەتە پیرۆزە ئەم حەقیقەت و ڕاستیەمان وەبیر دێنێتەوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا

﴿٤٥﴾ الأحـزاب: ٤٥. بـەو وشـەیەی کـە لەگـەڵ پێغەمبـەرﷺ فەرمایشـتی دەکات و دەفەرموێت: (یا أیهاالنبی)، (النبی) مەعریفەیە، چـونکە(ال)ی تـەعریفی لەسـەرە کەواتـە بـۆ ناسـراوە ، بـە مانـای: پێغەمبـەرێکی ناسراوە، واتە پێغەمبەرایەتیەکەی لەهەر گۆشەیەکەوە بۆی بڕوانی دیار و ناسراوە، بەڵکو پێغەمبەرایەتیەکەی بینراو و ناسراوە تەنانەت لـە لای بـێ گیانـەکانیش(الجمـادات)، چـونکە سـەلامیان لێکـردوە، ڕووەك و گیانلەبـەرەکانیش بـە گوێڕایـەڵی و مـل کەچـیان بـۆ فەرمانـەکانی ناسیویانە، ئەو پێغەمبەرە لە لای هەموو دروست کراوەکان ناسراوە، بە جۆرێك کە هەرگیز ئینکاری پێغەمبەرایەتیەکەی بە هیچ جۆرێك ناکرێت، دڵ ڕەقترین و بـوغزاوی ترینیـان لەحزوریـداﷺ نـەرم بـوون، ئایـا ئەمـە نایچەسپێنێ کە ئەو پێغەمبەرێکی ناسراوە ؟

لـە وشـەی (أرسـلناك)ی ئایەتـە پیرۆزەکـەدا بـە شـێوەی قسـە لەگـەڵکراو( مخاطـب)هـاتووە، پیتـی (ك) ئامـاژە و بـەزەیی و سـۆزی پێوەیە بۆ ئەو کەسەی کە بوەتە ڕەحمەت بۆ جیهانەکان.

شـایەت(شـاهدا) واتـە خـوای گـەورە (سـبحانە وتعـالی) بـە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێت: ئێمە تۆمان ناردووە بۆ مرۆڤایەتی تـاوەکو بەهـەموو خـەڵك ڕابگەیـەنی کـە "مـن بـوونم هەیـە"و زاتـی منیـان پـێ بناسێنی، تـۆش شـاهیدی منـی بەسـەریانەوە بـا هـەموو جیهـانیش بـە درۆت بخاتـەوە و، ئینکـاری ئـەو حەقیقەتـە بکـەن کـە تـۆ ئاشـکرای دەکەیت و بوونی زاتی من ڕادەگەیەنیت.

لەم پلەوپایەدا تۆ شایەتی، پاشان کۆمەڵێ شاهیدی تر هەن لە دوای تـۆوە دەڕۆن و شـوێنت دەکـەون، ئـەوان شـاهیدن بەسـەر مرۆڤایەتیـەوە، تـۆش دیسـانەوە شـاهیدی بەسـەر ئەوانـەوە، شـایەتی لەسـەر شـایەتیەکەی ئـەوان دەدەی، لـە ڕۆژی حەشـری گـەورەدا شـایەتیدانی ئوممەتەکـەی پێغەمبـەرﷺ بەرپرسـیاری و ئـەرك لەسـەر هەنـدێك لـە پێغەمبـەران لادەبـات، هـەروەك لـە فـەرموودەی پـیرۆزدا هاتووە، کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (لە ڕۆژی قیامەتدا حەزرەتی نـوح (سەلامی خوای لێبێـت) بـانگ دەکرێـت و پێـی دەوترێـت: ئایـا ئـەوەی خرایە ئەستۆت ڕاتگەیاند؟ ئەویش دەفەرموێت: بـەڵێ، گەلەکـەی بـانگ دەکرێن و پێیان دەوترێت: ئایا پێی ڕاگەیاندن؟ دەڵێن: کەس نەهاتووە ئاگادارمان بکات! یان کەس نەهاتووە بۆلامان!. خوای گەورە بـە نـوح دەفـەرموێت: کـێ شـایەتیت بـۆدەدات؟ حـەزرەتی نـوح دەفـەرموێت: محەممەد و ئوممەتەکەی، پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئـەوەتا خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾ البقرة: ١٤٣. دوو وشەی (الوسط)، (العدل) واتە: ناوەند و دادگەر، پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: بـانگ دەکـرێن و شـایەتی بـۆ حـەزرەتی نـوح دەدەن کـە ڕایگەیانـدوە و تـەبلیغی کـردووە، منـیش دەبم بـە شـاهید بەسـەر شایەتیەکەی ئێوەوە[1].

[1]- الأعتصام،١٩|المسند للامام احمد ٣٢/٣ |ابن ماجة ، الزهد ٣٤

## ٣- جیهاد سەرچاوەی ژیانە

جیهـاد سەرچـاوەیەکە ژیـانی لـێ هەڵـدەقوڵێ و، موسـوڵمانەکان دەخاتە چالاکیەکی بەردەوامەوە، هەر ئوممەتێك تاکەکانی لـە جیهـادی ماددی و مەعنەوی بێ بەش بکرێن، بێگومان ناکۆکی و دووبەرەکی لـەو ئوممەتەتەدا سەر هەڵـدەدات، بـەوەش لـە نـاوخۆدا دەگـەنێت و خـراپ دەبێت، عوسمانیەکان کۆتا نمونەی زیندوی ئەم ڕاستیەن، گومانی تێـدا نیـە "قـەدەر" حـوکمی کلۆربـوون و خـراپ بـوون و لـە کارکـەوتنی دا بەسەر عوسمانیەکاندا –هەروەك چۆن حوکمی دا بەسـەر ئوممەتـەکانی تردا– ئەم کارەش هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیـە کاتێـك کاربەدەست و بەرپرسەکان لـە کۆشـکەکانیاندا نـوقمی ئـارەزو بـازی و کاری رسوایی دەبن و بەرزکردنەوەی کەلیمەی خوا پشت گوێ دەخەن، ئەم شل و شێواوی وگوێ نەدانەیان لە ڕیزەکانی سوپادا بڵاو دەبێتـەوە و پەلوپۆ دەهاوێ، ئیتر وڵاتەکە لە نێوان وڵاتانی دنیادا ئەو جێگـە دیـار و بڵنـدەی خـۆی لـە دەسـتدەدات، ئەمـە سـەرباری ئـەو نەهامـەتی و بەدبەختیەی کە بەسەر ئەو ئوممەتەدا دێـت لەگـەڵ ئـەو دووبـەرەکی و ناکۆکیـە ناوخۆییانـەی کـە سـنورێکیان نیـە. بـەڵێ، ئـەم ناکۆکیـە ناوخۆیانەن وا دەکەن لە دەوڵەتێکی گەورە و پایە بڵند بـەرە و داڕمـان بڕوات و لە سەر زەویدا بوونی نەمێنێت.

ئێمـەش لـەو سـاتەوەختەوە کـە وازمـان لـە جیهـاد هێنـاوە، پەرتەوازی و داڕمان لە ناوماندا پەرەی سەندووە، ئـەو هـەموو کوتلـە و

کوتلـەکاری و دارمـان و پارچـە پارچـە بوونـەی لـەم کـات و سـاتەی ئێستاماندا دەیبینین ، بێگومان تەنها بەرو بومی تاڵی ئەو گوژاڵکەیە کە لەو تۆوە جەهەنەمیانەی ئەوکاتەدا پژان و بڵاوبوونـەوە و سـەوزبوون و گەشـەیان کـرد، بـە جیهـادیش نـەبێت لـەم بـارە نالـەبارە مرێنـەرە دەربازبوونمان نیە و نابێت. جیهاد لە لای ئیماندار بڵندترین مەبەسـت و ئامانج و مەزنترین نموونە و پێشەنگە کە بتوانێ خۆی لە پێناودا بـەخت بکات. چونکە کاتێك ئیماندار دەگاتە پاکیەتی تەواوەتی کە لە ئارەقەی رەنج و تەقەلاکانی دا نوقم بوەبێـت و بـە خـوێنی خـۆی دەسـت نوێـژی گرتبێت، ئەمەش بێجگە لەجیهاد بەهیچ شتێکی تر نابێت.

یەکێك لەو کەسانەی تامی ئەم چێژە بـەرزەیان کـردوە (حـەرامی کوڕی مەلحان) بوو، کاتێك کە تیرێکـی بەرکـەوت و کەوتـە سـەر زەوی، وتی:"الله أکبر" بە خوای کەعبە سەرکەوتم[1]. ئەگەر بەراوردێك بکرێت لە نێوان ئەو دەستکەوتەی (حەرامی کوری مەلحان) لەگەڵ ئەوتام و چێژە بەرزەی کە لەرێگەی خوادا چەشتی، ئەو کاتە بـە ڕاسـتی دەزانـین تـاچ رادەیەك سەرکەتوو بووە.بەڵێ، جیهاد بەسودترین سـەودا و بازرگانیـە، خوای گـەورە بـۆ ئـەم بازرگانیـە بـە سـودو قازانجـە بانگمـان دەکـات و دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ تِجَٰرَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿١٠﴾ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١﴾ ﴾ الصف: ١٠ – ١١. بـەو مانایـە خـوای گـەورە (سـبحانە وتعـالى) دەفـەرموێت: ئـەی

---

١– (فقال الله أكبرُ فُزتُ وَرَبِّ الكَعبة) البخاري، الجهاد، ٩، مسلم، الإمارة، ١٤٧.

ئیمانداران من بانگتان دەکەم بۆ بە سودترین و گەورەترین بازرگانی چونکە بەم بازرگانیە ژیانێکی هەمیشەیی و سەربەزی و بەختەوەریتان لە بەهەشتدا دەست دەکەوێت، ئەمە جگە لەوەی لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارتان دەبێت.

بەڵێ ئەو جیهادەی کە ڕوناك کەرەوەی هەموو لایەکی سەر ڕووی زەویە و، گەیاندنی نورەکانی ناوی سەرداری پێغەمبەران (سید المرسلین)ە بۆ تاریکترین شوێن و جێگە و، ڕوناك کردنەوەی گشت جیهانە بە نوری درەخشانی قورئان. ئەم جیهادە هەتا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، ئیماندارانیش دەچنە ئاست و پلەی بەرپرسیاری بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان و بوونیان بە ئوممەتی ناوەند (أمة وسطاً)و لەنێوان وڵاتان و گەلاندا مافی خۆی دەدەنێ.

## ٤- جیهاد هەستێکی بەرزو شکۆدارە

گەورەترین هەستێك کە پێویستە ئیماندار لێی بە ئاگا بێت هەستی جیهادە، ئەوەی ئەم هەستەی نەبوو، نابێت لە ناو زیندوەکاندا حیساب بکرێت، بگرە لەگەڵ کێلی قەبرەکاندا جیاوازیەکی نابێت، بە ڕاستی ئەو کەسە نوێنەری مردووەکانە و ئاماژەیان بۆ دەکات، پەروەردگاری میهرەبانیش بە هیچ جۆرێك بە سۆز و ڕەحمەتەوە بۆی ناڕوانێ، چونکە ئەوەی خۆی تەرخان نەکات بۆ گەیاندنی ناوی خوا بە هەموو لایەکی سەر ڕووی زەویداو نەیکاتە ئامانج و مەبەستی ژیانی خۆی، ئیدی جیاوازی نیە لە نێوان ئەو و بێ گیانەکاندا، چونکە مرۆڤی ئیماندار ژیان

و چالاکی به گوێرەی ئەو ڕۆحی جیهادە دەست دەکەوێت کە هەڵی گرتوە و بانگەشەی بۆ دەکات. بەڵێ ژیانی ڕاستەقینە بە بێ جیهاد نایەتە دی و، چاکترین و شکۆدارترین هەنگاوێك کە مرۆڤ دەینێت، بەڵکو گەورەترین هەنگاو و بەرهەمدارترین و بەسوودترینیان ئەو هەنگاوەیە کە بەرە و جیهاد دەینێت.

لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندیانەی کە ڕەسولی ئەکرەمﷺ هەیبوە و جێگەی تێ رامانە لە چوار چێوەی ئەو چاکسازیانەی ئەنجامی داون ئەوەیە: کۆمەڵێکی پێکهێنا کە لە مردن نەترسێ و، لەو شتەی کە بە ڕاستی بزانێ نەگەڕێتەوە لە ڕێگەی حەقداو، بەو پەڕی تواناوە پارێزگاری لە زیندویەتی و چوست و چالاکی خۆی بکات... ئەم کۆمەڵە هەمیشە بیری بەلای جیهادەوە بوو، بگرە بەم هۆکارە نهێنی نەمرییان دۆزیبوویەوە. بیگومان دەگەنە نەمری چونکە نامەی کردەوە چاکەکانیان تارۆژی قیامەت داناخرێت، بە هۆی ئەو هەموو فیداکاری و خۆبەختکردنە گەورە و مەزنانەی کە پێشکەشیان کرد، پاش ئەوەی لەڕێی بڵاو کردنەوەی ئیماندا بەگژ ئەو هەموو گیروگرفتانەدا چوونەوە. بەڵێ، هەرچەندە ئەوان لەم دنیادا لە بوعدە ماددیەکەوە کۆچیان کردوەو لێرە نەماون، ئێمە و هەموو ئەو بەرە و چەرخانەی پێشوو و ئەو بەرە و چەرخانەی لەمەودوا دێن، هەمیشە باس و خواسی چاکە و چاکەکاریەکانی ئەوان دەکەین کە بەسەر ئێمەوە هەیانە .

کاتێـك مـرۆڤ– ئیمـان دەهێنێـت بـە جیهـانێکی تـری دوای ئـەم جیهانە، ئیتر جیهاد لەلای دەبێتە بڵندترین فیکرو پـاکترین مەبەسـت و بـەرزترین ئـاوات. ئـەو هەسـت و سـۆزەی کـە لـە لای ئەصـحابە بەڕێزەکان(خوا لەهەمویان ڕازی بێت) نەش و نمـای کـرد و کامـڵ بـوو ، هەر هەمان هەستو ئیـدراکو تێگەیشـتن بـوو . دەتبیـنین پێشـبڕکێیان دەکرد بۆ بەشـداری کـردن لـە (جـەنگی بـەدر)دا، منـاڵان لەسـەر نـوکی پەنجـەی پێیـەکانیان دەوەسـتان تـا باڵابـەرز و گـەورە دەربکـەون، بـۆ ئەوەی بەشداری جەنگ بکەن...هەرکەسێکیان تەمەنی کەمبوایە و ڕێـی پێنەدرایە بەشداری بکات، توشی خەم و پەژارە دەبـوون،[١] دەیـانگوت: بۆچی پێغەمبەرﷺ ئێمەی لەگەڵ ژناندا داناوە؟ ئایا جیهاد کاری پیاوان نییە؟!، ئیـدی بۆچـی ئێمـە وەك ژنـان لەماڵـەکانمادا بمێنینـەوە؟ بـەم هەستە بەرز و پرشکۆیەوە ئەو کۆمەڵە بەختەوەرە دەرچوون بـۆ بـەدر، بـۆ جیهادێـك کـە ڕێـڕەوی چارەنوسـی مرۆڤایـەتی گـۆڕی ، چـونکە تـا ئەوکاتە کاریان لە چوارچێوی ڕێنیشاندان و تەبلیغدا بوو.

کاتێك خۆیان سازکرد بۆ جەنگ، پێغەمبەرﷺ ڕاوێژی بە خەڵکەکـە کرد، یەکـەم کـەس حـەزرەتی ئەبوبـەکر(خـوا لێـی ڕازی بێـت) هەسـتاو وتەی جوانی فەرموو، پاشـان حـەزرەتی عومـەر(خـوا لێـی ڕازی بێـت)، پاشان میقدادی کوڕی عـەمر گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! ئێمـە لـە گەڵتین پەروەردگار چۆن فەرمانی پێکردویـت وا بکـە ، سـوێند بـە خـوا

١– أنظر إلى مجمع الزوائد للهيثمي ٦٩/٦، حياة الصحابة للكاندهلوي ٩٤/٢.

ئێمە وەك بەنی ئیسرائیل بە تۆ نالێین کە بە حەزرەتی موسایان گوت: ﴿فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائدة: ٢٤، واتە: (خۆت و پەروەردگارت بڕۆن بجەنگێن ئێمە لێرە دانیشتوین) بەڵام ئێمە دەڵێین: خۆت و پەروەردگارت بڕۆن بجەنگێن ئێمەش لەگەڵتا دەبین و دەجەنگێین، بەو کەسەی تۆی بەحەق ناردوە، ئەگەر بمانبەی بۆ(برك الغماد) –یەکێکە لە شارەکانی حەبەشە– لەگەڵتدا بەرگە دەگرین و بە ئارام دەبین تادەیگەینێ. پێغەمبەرﷺدوعای خێری بۆ کرد. پاشان پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەی خەڵکینە ڕاوێژتان پێدەکەم ئەمەوێ ڕاتان بزانم – مەبەستی ئەنصار بوو– چونکە ئەوان زۆرینەی خەڵکەکە بوون. سەعدی کوڕی موعاذ وتی: سوێند بەخوا لەوە ئەچێ مەبەستت ئێمە بێت ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرموی: بەڵێ. ئەویش وتی: ئیمانمان پێ هێنای، بە ڕاستمان زانیت، شایەتیمان دا ئەوەی هێناوتە حەق و ڕاستە، لەسەر گوێڕایەڵی پەیمان و بەڵێنمان پێ دایت، ئەی پێغەمبەری خواﷺچیت دەوێت بیکە، سوێند بەوکەسەی تۆی ناردوە، ئەگەر ئەو دەریایە بێتە بەردەممان و، بچیتە ناوی ئێمەش لەگەڵت دێینە ناوی تاکە پیاوێکمان دوا ناکەوێت، هەرگیز پێمان ناخۆش نابێ سبەینێ ڕووبەڕووی دوژمنەکەمان ببینەوە، ئێمە لە جەنگدا ئارام گر و، لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا ڕاست بێژین... لەوانەیە تۆ بۆ کارێك دەربچی و خوای گەورە کارێکی تری بۆت بوێ، بزانە خوای گەورە بەرەو چیت دەنێرێت و، چی دەوێت ئەنجامی بدە، هەر پەیوەستنامەیەك دەتەوێت

لەگەڵ هۆزەکانی تر بیبەستیت یان بیپچڕێنیت ئەنجامی بدە، لەگەڵ کێ جەنگ دەکەی یان سوڵح و ئاشتی دەکەی بیکە، لەماڵ و سامانی ئێمە چیت دەوێت، بیبە...

پێغەمبەرﷺ بەقسەکانی سەعد زۆر خۆشحاڵ بوو و فەرموی: بە بەرەکەتی خواوە بڕۆن و مژدەتان لێ بێت، خوای گەورە یەکێك لەو دوو چاکەیەتان دێنێتە ڕێ (سەرکەوتن یان شەهیدی)، سوێند بەخوا شوێنی کوشتنی سەرکردەکانی قورەیش دەبینم،[1] ئەمجا ئەصحابە بەڕێزەکان لە جۆش و خرۆشێکی وەهادا بوون بە ڕادەیەك کە ئەو کافرانەی لە مەیدانی جەنگ هەڵهاتن و ڕایان کردەوە بۆ مەککە وتیان:

ئەوان هەموو بە یەکجار هێرشیان کردە سەرمان دەتوت ئێمە قۆڵ بەست کراوین و دراوینە دەستیان، ئەوانیش دەیاندا لە ملمان و سەری پەنجەکانمان.

بەڵێ، جیهاد فەرزو پێویستە ئەگەر لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کۆمەڵێك نەبن ئەم ئەرك و فەرمانە قورئانیە[2] جێ بەجێ بکەن، بۆ بەردەوام بوونی هەژموون و دەستەڵاتی ئاینی پاکی ئیسلام و ڕزگار بوونی موسوڵمانان لە سەرشۆڕی و ڕسوایی، ئەو کاتە ژیانی ئیسلامی

---

١- دلائل النبوة للبيهقي ١٠٧/٣، السيرة النبوية لابن هشام ٢٦٦/٢-٢٦٧، تفسير القرآن العظيم لابن كثير٥٥٥/٣(بإختصار).

(سيروا على بركة الله و أبشروا، فإن الله قد وعدني إحدى الطائفتين، والله بكأني أنظر إلى مصارع القوم).

٢- أنظر إلى: سورة آل عمران: ١٠٤.

بوونی نابێت، جا ئەگەر ژیانێکی ئیسلامی "فەردی" و تاك و تەنیا لێرە و لەوێ ببێت، ئەوە بێ پاڵپشت و ڕاگر دەبێت. هەر کات موسوڵمانان دەست بەرداری ئەم ئەرکە بن، ئیتر پشت لە خۆیان وەردەگێڕن و سوك و ریسوا دەبن، ئەگەرچی ئاسمانی پان وبەرینیان بڕیبێت و پەیوەندیان لە نێوان هەسارە و ئەستێرەکاندا دروست کردبێت، بەتەنها پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و پیشەسازی لەو نزمی و سوکیە ڕزگاریان ناکات. دەی خۆ جیهاد فەرزی کیفایەیە، خۆ ئەگەر کەسێك نەبێت بە جوانی جێبەجێی بکات و وەك ئەم سەردەمەی ئێمە بە تەواوی پشت گوێ بخرێت ، ئەوا دەبێتە فەرزی عەین و هەموو تاکێکی موسڵمان لای خوای باڵادەست لێی بەر پرسیار دەبێت.

هەروەها دەوڵەتیش جیهادی ڕێك و پێك(منظم)ی لەسەرە، جاری وادەبێ سوپا ئەو ئەرکە دەگرێتە ئەستۆ، دەشگونجێ هێزی ئاسایش و ناوخۆ ئەو کارە بگرنە ئەستۆ و ئەم دوانە بەرامبەر دەستدرێژی کەرانی دەرەوە و ناوەوە تێدەکۆشن. جیهادی سەربازی ئەم ئوممەتە تێکۆشەر و موجاهیدەیش ڕەگەزی هاوسەنگی یە بۆ هەموو جیهان، دەشبێتە هۆی هاوسەنگی نێوان دەوڵەتەکاتان، بێگومان خوای گەورە(سبحانە وتعالی) ئەم ئەرکە گەورەو پیرۆزەی خستوەتە ئەستۆی ئەم ئوممەتە.

تاکو ببێتە ڕەگەزی هاوسەنگی لەسەر زەویدا پێویستە سوپایەکی ببێت، لە ئاستی تێگەیشتنی ئەم ئەرکەدا بێت کە پیرۆزترین و بڵندترین

ئەرکە. کەواتە هاوسەنگی لە سەر زەویدا نابێت، ئەگەر ئوممەتێك نەبێت بەڵێن بدات و ئەم ئەرکە بگرێتە ئەستۆ.

چەندە ئازار بەخشە دەبینین ئیمانداران ماوەی دوو سەدە یان سێ سەدەیە بوونەتە گەمەی دەستی خەڵکانی تر و، ئەوان بڕیار لە سەر چارەنوسیان دەدەن، خۆیان ناتوانن ڕۆڵی خۆیان لە هاوسەنگی جیهاندا ببینن. هەروەك مزگەوتەکانی ئیمانداران بوونەتە مەنزڵ و جێگەی هەژار و تەمبەڵان، تەکیەکانیش بوونەتە هێلانەی ئەوانەی لە عەشق بێ بەشن، قوتابخانەکانیش گۆڕان بۆ شوێنی خوێندنی ماددی ڕۆژئاوا(سکولاستیك)، بگرە وایان لێ هاتووە لە چارەسەری کێشەکانیاندا دەڵێی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ماونەتەوە و چەقیون. دەی ئەوانەی کە لە تێگەیشتنی سەردەمی خۆیان بێبەشن چۆن دەتوانن لە هاوسەنگی وڵاتاندا قورسایی وسەنگی خۆیان بسەپێنێن.

من وای بۆ دەچم ئەگەر ئیمانداران لە بواری هونەر و پێشکەوتندا پێش ئەو سەردەمەی خۆیان نەکەون، یاخود لە ژیاندا بە تاسە و عەشقەوە چەشنی ئەصحابەی کیرام نەژین، یان وەك تابعین لە گوێڕایەڵی و عیبادەتدا پەیوەندییەکی توند و تۆڵ لەگەڵ خوادا نەبەستن، کارکردن بە ناوی ئیسلامەوە ناگونجێ و ناکرێت. چونکە ئەوەی لە ئاستی سەردەمەکەی خۆیدا نەژی و، بە دەرمانی سەردەمەکەی خۆی گیرو گرفت و تەنگ و چەڵەمەکانی چارەسەر نەکات ، ناتوانێت هیچ کارێك بەناوی ئیسلامەوە ئەنجام بدات.

هـەر نەتەوەیـەك یـان هـەر تاكێـك كـە عیـززەت و شـكۆمەندی ئیسلامەتی هەڵگرتبێت پێویستە خۆی بـە بـەرپرس بزانێـت لـەم ئەركـە بـەرزو بڵنـدەدا، كـە ئـەركی جیهـادە، ئـەو گـەل و نەتەوانـەی یـان ئـەو تاكانەی هەست بە بەرپرسی خۆیان ناكـەن بەرامبـەر بـەم ئەركـە، هـیچ بەشێكیان لە بەرزی و شكۆی ئیسلامەتیدا نیە.

جیهـاد ئـەركێكی پـیرۆزە و بەرپرسـیارەتیەكی مەزنـە، پێویسـتە هەمیشە كۆمەڵێك بەئاگا و ئامادەباش بن، بـەم وریـایی و چـاوكراوەییە ئوممەت ڕزگاری دەبێت لە هەموو ترسناكیەك كە دەوری دەدات و، بـەر پەرچی هەموو هێرشێكی ماددی و مەعنـەوی دەدرێتـەوە كـە لـە لایـەن دوژمنانی ناوخۆ و دەرەوە چاوەڕوان دەكرێت بكرێتە سەری ، تەمەن و چركەساتەكانی ئەو ئێشكگرانەی كـە هـەوڵ و تەقالایانـە بـۆ جێبـەجێ كردنی ئەم بەرپرسیاریە، زۆرگرنگ و پـیرۆزە و دەبێتـە چـەندین سـاڵی عیبادەت، ساڵەكانیان وەك چـەرخ و سـەدەیان لـێ دێـت، ئـای چـەندە خۆشبەختن! هێشتا لە دونیادان دەستیان دەگاتە نەمری و جاویـدانی، چونكە ژیانیان تـەرخان كردووە بۆ ئەم ئەركە، ئـەو كەسـانە خـواردن و خواردنەوە و نوستن و هەستانیان بۆ دەبێتە پەرستش و بەندایەتیـەكی وەرگیراو، لەسەری پاداشت دەدرێنەوە.

(گومانی تێدا نیە چاكە و جوانی دابـەش دەبـن بـە دوو بەشـەوە، شتێك خۆی لە خۆیدا جوان و چاكەو، شـتێكیش غـەیری خـۆی جـوان و چاكی دەكات، هەر شتێك خۆی لە خۆی دا چاك و جـوان بـوو دەوتـرێ

خود و زاتی ئەو شتە چاك و باشە(حسن لزاتة)، بەلام ئەگەر خۆی لە خۆیدا چاك و جوان نەبێت بەڵكو ئەنجامەكەی چاك و باش بوو، ئەوە پێی دەوترێت (حسن لغیرە) غەیری خۆی جوان و چاكی كردووە) جیهادیش دەكەوێتە ئەم بەشەی دووەمەوە، ئەمەش بەواتای: جیهاد لە خودی خۆی دا جوان نیە، لەبەر ئەوكوشتن و وێرانكاریەی كە تیایەتی، بەلام ئەوەی جیهاد جوان دەكات ئەوەیە كە دەبێتە هۆكار بۆ كاروباری چاك و باش. بۆ نمونە: جیهاد هۆكارە بۆ بەرزكردنەوەی وشەی (الله)، هەروەها بۆ ئەوەی ئیماندار وا لێ بكات زاڵ و بە توانا بێت لە هاوسەنگی كار و بارەكانی سەر زەویدا و، بۆ بەرەنگاربونەوەی ئەو دەست درێژیانەی دەكرێنە سەر ئیسلام و موسوڵمانان و بۆ بەرگری كردن لە لاواز و چەوساوەكان... لەم دیدانەوەیە جیهاد جوان و قەشەنگە. لەبەر ئەمە ڕاستە گەر بوترێت: جوانی و چاكی و باشیی جیهاد بەندە بە ئامانجەكەیەوە كە بریتی یە لە بەرزكردنەوەی وشەی (الله).

بەڵێ ئیماندار سەردەكەوێتە سەر ئەسپەكەی و سواری فڕۆكە دەبێت و دەبابە لێ دەخوڕێت و موشەك بەكاردەهێنێت ... بەلام ئەمانە تەنها بۆ بەرزكردنەوەی كەلیمەی (الله) بەكاردەهێنێت.

بەڵێ، ئەو جیهادەی كە ئیماندار فەرمانی بەسەردا دراوە كە جێبەجێی بكات ئەمەیە، وەنا بۆ دەمارگیری و خزمایەتی و هۆز، یان بۆ هەر ناوێكی تر. پێغەمبەرﷺ زۆر بە جوانی بۆمان ڕوون دەكاتەوە

لەو فەرمودەیەی کە ئیمامی بوخاری و موسلم ڕیوایەتیان کردووە، دەفەرمویٚ: (مَنْ قاتل لِتكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ العُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ)[1]، واتا پێچەوانەو موخالیفەکەی ئەمەیە: ئەوەی نەجەنگیٚ بۆ بەرز ڕاگرتنی کەلیمە و وشەی (الله) و، بۆ بەرز کردنەوەی بەیداخەکەی لە ئاسۆکانی جیهاندا، ئەوە هیچ بەش و شانسێکی لە جیهاددا نی یە، بەوەش هیچ جوانیو چاکەیەکی تێدا نابێت. بەڵیٚ، جیهاد کاتیٚجیهادە بۆ بەرزکردنەوەی کەلیمەی (الله) بێت، موجاهیدیش تێدەکۆشێت بۆ بەرز ڕاگرتنی کەلیمەی (الله) و ڕۆشن کردنەوەی هەموو تاریکیەکانی سەر زەوی، ئیدی موجاهید چۆڵەوانیەکان دەبڕێت و شاخ و دارستانەکان تەی دەکات تا دەگاتە دەریا گەورە و زەریاکان ئەو کاتە ئەوە دەڵێتەوە کە عوقبەی کوڕی نافیع (خوا لێی ڕازی بێت) دەیگوت: (ئەی پەروەردگار! ئەگەر ئەم دەریا فراوانە نەبوایە بەردەوام دەبووم لەسەر ڕۆیشتن بۆ وڵاتان و تێدەکۆشام لە پێناو ڕێگەکەی تۆدا)[2] ئەگەر بە تەنیاو هەر خۆی لە دوورگەیەکی چۆڵدا دابینێن، دەگەڕێت بۆ هۆکارێك (لە جۆرێکی تر) بۆ بەرز و بڵند کردنەوەی کەلیمەتو(الله)، لەوانەیە جنۆکە و ڕۆحە چەپەڵەکان ئاگادار بکاتەوە و بانگەوازیان پیٚ بگەیٚنێت. هەروەك پێغەمبەرﷺ بە نمونەی ئەمانەی فەرموبێت: (الجهاد ماضٍ إلى

---

١– البخاري، العلم، ٤٥، مسلم، الإمارة، ١٤٩–١٥١ أبو داود، الجهاد، ٢٦.

٢– الكامل في التأريخ لابن الأثير ٤/١٠٦.

يـومِ القيامـةِ)[1]، (جيهـاد تـا ڕۆژى قيامـەت هـەر دەمـێنێ و بـەردەوام دەبێت).

دواى فەتحى مەككە پياوێك هات و لە پێغەمبەرى ﷺ پرسى: ئـەى پێغەمبەرى خوا ﷺ من دەمەوێت هيجرەت بكـەم، پێغەمبـەر ﷺ وەڵامـى دايەوە فەرمووى: (لا هِجرَةَ بَعدَ الفتح وَلَكِنْ جِهـادٌ وَنِّيـةٌ)[2]، ( دواى فـەتحى مەككە هيجرەت نـەما، بـەڵام جيهـادو نييـەت مـاوە و هـەر دەمێنێـت).

هيجرەت لە پێش فەتحى مەككـەدا مانـا و مەغزايـەكى تايبـەتى هـەبوو، چونكە هيجرەت واتاى جيهاد بوو، بەڵام دواى فـەتحى مەككـە هيجـرەت ديد و مەودايەكى گرنگـى تـرى لـە مـەودا فراوانـەكانى جيهـاد بەدەسـت هێنا، واتە لەبەر ئەوەى هيجرەت ماناو مەوداى تايبەتى خۆى هەيە، بـە جيهاد ئەژمار ناكرێ، بەڵێ جيهاد نيە، بەڵكو –لەڕوويەكەوە– بە جيهاد دادەنرێت.

پاش فەتحى مەككە ئەوە نەما هيجـرەت بـەوە ئـەژمار بكرێـت كـە مرۆڤ جێگەيەك بـەجێ بێڵێـت و كـۆچ بكـات بـۆ جێگەيـەكى تـر، بـەڵكو ئيماندار دەتوانێت لە شوێنى خۆيدا جيهاد بكات، ئەمەش بـەوە دەبێـت كە هەموو مرۆڤێك ئـەو ژينگەيـەى بگۆڕێـت بـۆ باخچـەيەكى چـڕو پـڕ و دەوروبەرى بكاتە باخچەيەكى دڵگير. هەركاتيش پێويست بوو بچێت بـۆ جێگايەكى تر بێگومان ئامادەيە و بەوكارە هەڵدەسێت.

---

١– مجمع الزوائد للهيثمى ١٠٦/٥.

٢– البخاري، الجهاد، ٢٢٧، مسلم، الإمارة، ٨٥، أبوداود، الجهاد، ٢.

## ٥- جیهاد مێرگێکی بەرینی بەبەرەکەت و بەرهەمدارە

بێگومان هەرشتێك ببێتە هۆکاری خەیر و چاکە ئەویش هەر خەیرو چاکەیە، هەروەها هەرشتێك ببێتە هۆی شەڕو خراپە ئەوا خودی شتەکەش خۆی شەڕ و خراپەیە، ئەوەی خودی خۆی و ژیانی خۆیشی تەرخان کردوە بۆ خەیرو چاکە و لەگەڵ کرداری چاکدا دەست لەملانە، ڕۆژ بۆ ئەو کەسە تەنها ئەو بیست و چوار کاتژمێرە نیە، بەڵکو چەندەها ساڵی دوورو درێژە. چونکە هەر بیست و چوار کاتژمێری ڕۆژەکەی لە نامەی کردەوەکانیدا هەمووی خێرو چاکەیە، ئەگەر ئەو خۆی پێشەکەش بە بانگەوازەکەی کردبێت و بە خۆشویستنی حەقیقەتەوە ژیابێت و، بە حەق شەیدا و سەوداسەر بێت، بێگومان ئەوکاتە لەم تەمەنە کەم و کورت و سنوردارەدا ، بگرە لەکاتی خەوتن و هەستانەوە و لەکاتی خواردن و خواردنەوە و کۆچ و نیشتەجێبووندا بەم تەمەنە کورت و سنوردارە تەمەنێکی نەبڕاوەو بێ سنوورو هەتاهەتایی دەست دەکەوێت. خوای تەعالا لە پاداشتی ئەو نیەتە چاکە و بەرنامە ڕێژیەی کە هەیەتی بۆ پیادەکردنی ژیانی، بەگوێرەی بیرکردنەوە چاك و ئیجابیەکانی بۆ بانگەوازەکەی خاڵە تاریکەکانی ژیانی ڕۆشن دەکاتەوە و، بە بەخشش و چاکەی خۆی دەیگەیەنێتە ئاسۆ ڕوونەکان.

لە ژیانی وەها کەسێکدا کە خۆی بەخشیبێ بە خوا و بە ڕێبازی خوا، تاکە خاڵێکی ڕەش نابینیت، هاوکات شەوی وەك ڕۆژ وایە، بەڵێ

ئەو هەموو چرکەیەك لـە تەمـەنی وەك چـەندەها سـالْ لـە بەندایـەتی و پەرستش وایە. چۆن نـا ! کـە ئـەو لـە ڕێگـەی چاکەدایە، چـونکە هـەر شتێك لە پێناوی(باقي)دا بەخت بکرێت پاداشتی مەزنی هەیـە درێـژ بێ یان کورت ، هەر لەبەر ئەمەشە کە تەنها ساتێکی چاکترە لـە هـەزارەها سالّی ژیانێکی مردوی نەزۆك.

لەبەرئەوەی ئەصحابە بەڕێزەکان(خوا لێیان ڕازی بێت) ئەم جۆرە نهێنیانەیان چـاك دەزانـی و دەچـونە خزمـەت پێغەمبـەرﷺو پرسـیاری زیاتریان لە بارەی خەیر و چاکەوە لێ دەکـرد، هـەتا هـی وایـان هـەبوو پرسـیاری لـێ دەکـرد: (کـارێکم نیشـان بـدە، ئەگـەر ئـەنجامم دا بچـمە بەهەشت)[1]. ئەوان عەقلّیان بە ناسین و مەعریفـەتی خـودا نـووراني بـوو بـوو، بـەردەوام بـە دووی ڕێگـەی خێـردا دەگـەڕان. ئەمـەش بـە مانـای ئـەوەی بـە دوای ئـەو هۆکارانـەدا دەگـەڕان کـە ڕێگـەی نـەمری و هەمیشەییان بۆ ئاسان دەکـات. هەمیشـە لـە ڕێگاکـانی خێـر و چـاکەدا بەبێ ماندو بوون دەگەڕان و پرسیاریان ئاڕاستەی پێغەمبەرﷺ دەکرد. بگرە وا بەدی ئەکرا کە لەم ڕێگایەدا پێشـبڕکێ دەکـەن. بۆیـە دەبیـنین هەموویان بە ژن و پیاو و پـیر و گەنجـەوە لـە هـەوڵ و کۆششـێکی بـێ وچان و بەردەوامدا بوون، لە خەیر و چاکەدا لێبڕان و عەزم و جەزمێکی تـەواویان هـەبوو کـە دووربـن لـە هـەر شـتێك کـە ببێتـە بەربەسـت لـە بەردەمیاندا.

---

١- البخاري، الزكاة، ١.

بۆ نمونه:

نوسەیبەی مازنی(خوا لێی ڕازی بێت): ئافرەتێك بوو ژیانی بە جیهاد گوزەراند. بە خۆی و مێرد و منداڵەکانیەوە خۆیان تەرخان کردبوو کە لە ژێر فەرمانی پێغەمبەرداﷺبن. کاتێك مەدینەی مونەوەرە بە هیجرەت و کۆچی پێغەمبەرﷺ پیرۆز و شکۆدار بوو، لە مەدینە نیشتەجێ بوو.

نوسەیبە بەشداری لە (بەدر) و (ئوحد)دا کرد، ئەو برین پێچی و تیماری بریندارەکانی دەکرد، بەڵام کاتێك کە جەنگ گەرم بوو، چووە ناوجەرگەی جەنگ و پاڵەوانانە جەنگا، کە تاکە مەبەست و ئامانج و ئاواتی گەورەی لە هەموو جموجوڵێك و هەستان و دانیشتنێکیدا ئەوە بوو کە لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بەشداری جیهاد بێت . لەوانەیە ناخۆشترین کاتەکانی ژیانی کە لە دڵە ڕاوکێ و دوودڵیدا بووبێت، ئەو کاتە بوبێت ئایەتی پۆشتەیی"حیجاب"نازڵ بوو کاتێك پێغەمبەرﷺ پێی ڕاگەیاند کە لە جەنگەکاندا نابێت لەگەڵ پیاواندا بەشدار بێت، بە جۆرێك کە گریان قوڕگی ئاخنی بوو وتی: چۆن من لێرەبم و تۆ جیهاد بکەی یا ڕەسول اللهﷺ.[1] ئیدی زۆر نیگەران و دڵگران بوو چونکە لەوێ

---

١- حياة الصحابة للكاهندهلوي ٥٩٧/١-٥٩٨، أسد الغابة لابن الأثير ٢٨٠/٩، الإصابة لابن حجر ٤١٨/٤.

ئەوەش ئیبن عومەرە(خوا لێیان ڕازی بێت) دەڵێت: تەمەنم سیانزە ساڵان بوو کاتێك پێغەمبەرﷺ دەرچوو بۆ غەزای بەدر، بە پەنجەی موبارەکی ئاماژەی بۆکردم کە بگەڕێمەوە، ئیتر ئەو شەوە چوومە ناو جێگەوە، سوێند بە خوای گەورە لە تەمەنمدا هیچ کات وەك ئەو شەوە خەفەتم نەخواردوە.

ئەوەش عومەیری کوڕی ئەبی وەققاص برای سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص(خوا لێیان ڕازی بێت) ، ئەو لە ڕۆژی بەدردا منداڵێك بوو لە تەمەنی سیانزە ساڵ تێپەڕی نەدەکرد. لەسەرنوکی پێ دەوەستا بۆ ئەوەی بەرز بنوێنێت و بەشداری جیهاد بکات. کاتێك پێغەمبەرﷺ ڕەزامەندی نواندکە بەشداربێت، خەریك بوو لە خۆشیدا بفڕێت چونکی دەرگایەیەکی بۆ خێرو چاکە بۆ خرایە سەرپشت و ئەویش لێیەوە چووە ژوورەوە و شەهید بوو.

ئەبو سوفیانیش تا ڕۆژی فەتحی مەککە هەر دژایەتی پێغەمبەریﷺ دەکرد، بەڵام کاتێك موسڵمان بوو بەردەوام بۆ دەرگای خێرو چاکە دەگەڕا، ئەوەی بە شوێنیدا دەگەڕا لە جیهاددا دۆزیەوە: چاوێکی بە تیری دوژمن پێکرا، گفتوگۆی لەگەڵ چاوە پێکراوەکەیدا دەکردو پێی دەوت: باشە کەڵك و قازانجی تۆ چی یە کە هاوەڵەکەتت بۆ ماوەی حەفتا ساڵ پێ نەبینی؟ چاوەکەی لابرد و فڕێی داو هێرشی بردە سەر ڕیزەکانی دوژمن.

حاریسی كوڕی هیشام (خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ سوپا دە هەزاریە پاڵەوانەكەی موسوڵمانەكاندا بوو، كە بەرامبەر سەد هەزار لە سوپای بێزەنتیەكان ڕاوەستا، دەڵێت: "ئەی ئەوانەی لە بەردەستی پێغەمبەرﷺ لە بەدردا جەنگان و هەوڵ و كۆششی زۆرتان داو بە نەفسی خۆتان لە ئوحوددا جیهادتان كردو، لە حودەیبیەدا بەیعەتان دا بە ڕەسول اللهﷺ-چونكە لەوكاتەدا خۆی لە نێو ئەواندا نەبوو- وەرن با ئەم بەیداخە بەرز ڕاگرین و یارمەتی یەكتر بدەین و نەهێڵین بكەوێتە سەرزەوی". بەم شێوەیە ئەم بەیداخە نەكەوتە سەرزەوی، بەڵێ هەرچەندە دەستاو دەستیی زۆری كرد بەڵام نەكەوتە سەر زەوی، نەكەوتە سەر زەوی ئەگەرچی چەندین دەست لەو پێناوەدا پەڕین،بەدەستەكانیان ئەو بەیداخەیان پاراست تا بڕانەوە، پاشان بە قاچەكانیان بەرگریان لێكرد هەتا ئەوانیش پەڕین ... دواتر بە جەستەكانیان پاراستیان تا بە شەهادەت گەیشتن، بەڵام بەیداخ و ئاڵاكە نەكەوتە سەر زەوی. ئەگەر لەو ڕۆژەدا دوژمن هێرشی بكردایە و هەنگاوێك بەرەو پێش بهاتایە دەبوو بەسەر لاشەی هاو وینەی حاریسی كوڕی هیشام دا(خوا لێی ڕازی بێت) هەنگاوی بنایە، هەتا لاشەكەی بوو بە چەند پارچەیەك.

ئەمانە بە دەردی جیهادكردن موبتەلا بوون تەنها بە جیهادیش تیمار دەكرێن.دوای وەفاتی پێغەمبەرﷺ چەندجارێ گەورەمان بیلالی حەبەشی(خوا لێی ڕازی بێت) داوای مۆڵەتی لە گەورەمان حەزرەتی

ئەبو بەکر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) کـرد کـە لـە مەدینـە دەرچـێت، بـەڵام هەموو جارێك داواکـەی ڕەت دەکـردەوە، چـونکە حـەزرەتی ئەبوبـەکر (خـوا لێـی ڕازی بێـت) بـە ناسـنامە و یادگاریـەکی پێغەمبـەری خـوای دەزانی. بەڵام بیلال لـە شـەوق و تاسـەی جیهـاددا هـەڵ دەقرچـا، ئـەو خووی بە هەڵکێشانی شمشێر و بەرزکردنـەوەی بەیداخـەوە گرتـووە لـە گۆڕەپانـەکانی جەنگـدا، ئـەو لـە جیهـاددا هـاوەڵێتی پێغەمبـەری ﷺ کردبوو، هەر لەبەرئەوە بوو لەلای گران بوو تەنها بۆ ئەرکی بانگ دان لە مەدینەدا بمێنێتەوە... لە ڕۆژی هەینی دا کاتێك کە حەزرەتی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت) وتاری دەدا هەستایە سەرپێ وتی: ئـەی ئەبوبـەکر تۆ منت لە کۆیلەیی ڕزگـارکرد، ئەگـەر بـۆ خۆتـت کڕیـوم ئـەوا دەربیـازم مەکە !، گەر لە بەرخاتری خواو بۆ خوا ڕزگارت کـردوم؟ ئـەوا وازم لـێ بێنە و دەست مەهێنە ڕێگەم با بچم بۆلای خوای گەورە. بیلال دەچـێت بـۆ شـام و لـە جەنگێکـدا شـەهید دەبێـت و لـە گـۆڕێکی نەناسـراودا و لەشوێنێکی نادیاردا ئەسپەردە دەکرێت، ئەگـەر ئـەو شـۆڵەی جیهـاددە نەبوایە کە لە ناوەوەیدا هەڵگیرسابوو، هـیچ شـتێك نەیـدەتوانی بـەرە و ئەو شـوێنەی ببـات.(ئەبوخەیسـەمە)ش(خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـەکاتی دەرچوونی ڕەسول اللهﷺ و یارانی دا بۆ جەنگی تەبووك، بە هەر هۆیەك بێت لێیان بەجێما، بەم دواکەوتنەی ویژدانی سـزای زۆری دەداو کەوتـە دڵە خورپەیەکی زۆرەوە، تا بە پەلە بـە دوایانـدا بـەرەو تـەبووك کەوتـە ڕێ، کاتێك ئەسپەکەی ماندو دەبوو زینەکەی دەخستە سەرشـانی و بـە

پیادە دەڕۆیشت، کاتێك پێغەمبەرﷺ و یارانی کە لەو کاتەدا ئەمان لەسەر ئاوێك بوون، بینیان تەپو تۆزێکی زۆر لە ڕووی مەدینەوە بەرەو لای ئەوان هات، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (یا خوا ئەبوخەیسەمە بێت)، دوای کەمێك ئەبوخەیسەمە دەرکەوت. پێغەمبەرﷺ بە هاتنی زۆر خۆشحاڵ بوو فەرموی خێر و بەرەکەتت هێنا بێت، ئەبوخەیسەمە لە کاتێکداکە خۆی خستە باوەشی ڕەسول اللهﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ خەریك بوو تیا بچم! چونکە دواکەوتن لە جیهاد گوناه و تاوانێکی گەورەیە، ئەبوخەیسەمە دەترسا بەهۆی ئەم گوناهە گەورەیە لە ناو بچێت.

جیهاد دەروازەیەکی گەورەی چاکەیە، ئەوەی لەم دەرگایەوە بچێتە ژوورەوە بێگومان یەکێك لەم دوو پاداشت و چاکەیەی دەست دەکەوێت، یان ئەوەیە شەهید دەبێت و ژیانێکی نەبڕاوە و هەتا هەتایی دەست دەکەوێت، یان دەبێتە تێکۆشەر و موجاهید و بەختەوەریی ئەم دونیا و دواڕۆژی دەست گیر دەبێت، لە جیهاددا بەرەکەتی گەورەی هاوشێوەی ئەمانە زۆرن.

## ٦- جیهاد سەرچاوەی ژیانێکە مردنی تێدا نییە

ئەوە ڕاستییەکەو هیچ ڕویەکی تر هەڵناگرێ، ئەوانەی لە ڕێی خوادا شەهید دەبن، زیندونو لەلایەن خواوە ڕۆزیان بۆ دابین دەکرێت، ئایەت و فەرمودەی پیرۆز و ڕوداوی مێژوویی زۆر هەن کە بەلگە بن لەسەر ئەم باسە.

بۆ نمونە (سلێمان شا) لە گەورە و سەردارانی عوسمانیەکان بـوو، هـەروەها لـە موجاهیـدە پێشـەنگەکان بـوو، بـرای گـەورەی (سـوڵتان موراد)بوو چاوەڕوان دەکرا دوای باوکی دەسەڵات بگرێتە دەست، بـەڵام بەرپرسیارەتی ڕێکخسـتنی ئـەو هێـرش و شـاڵاوانەی گرتـە ئەسـتۆ کـە دەکرانە سەر ئەوروپا و دەبووە هۆی شکاندنی بێزەنتیەکان، لـە کردنـە ئەوبـەری(قـەڵای چـناق)دا بـەهۆی بەلەمەکانـەوە لـەڕووی ئـەورووپاوە سەرکەوتوو بوو و، (غالی بولی) گـرت و خسـتیە سـەر دەسـەڵاتەکەی و بـەرە و پـێش چـوو تـا گەیشـتە (بـولایر)، لـە کاتیکـدا هـەموو خـەڵکی چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیـان دەکـرد کـە دەسـەڵات بگرێتـە دەسـت و ببێتـە خەلیفەیان، بەڵام ئەو لە ویژدانیـدا هەسـتی بـە شـتێك دەکـرد هـەروەك مـژدە دانێـك بێـت لـە شـوێنێکی دوورەوە... هـەموو بەرپرسـەکانی موجاهیدەکانی کۆکردنـەوە و پـێی وتـن: ئەگـەر ئـەمڕۆ مـن مـردم، بـا بێزەنتیـەکان ئـەم هەلـە نەقۆسـتنەوە و، هێـرش بێننـەوە سـەر ئـەو شوێنانەی کە ڕزگارمان کردون، وەسیەتم بۆتـان ئەوەیـە کـە هـەمووتان لەسەر تەرمەکەم دەست بدەنە دەستی یەکتر و هەموو بەیەکجار هێرش بەرن و پشت بـەخوا ببەسـتن، ئاگاتـان لـە خۆتـان بێـت لـە جیهـاد دوا نەکەون.

لە بەیانیدا قاچی ئەسپەکەی کەوتە چاڵێك و بەسـەرداکەوتەخوارو شەهید بوو، هەروەك پێش بینی کردبوو هاتە دی، گەورە و بەرپرسـانی سـوپا لەسـەر تەرمەکـەی کۆبونـەوە و هـەموو پێکـەوە وەك یـەك پیـاو

هێرشیان بردە سەر دوژمن، سەربازەکانی بێزەنتیەکانیان تەفرو تونا کردن و هەموویان هەڵهاتن و ڕایان کرد، دوای ماوەیەك بێزەنتیەکان بە سەربازی موسڵمانەکانیان گوت: ئێوە سوار چاکێکی باڵا بەرزی مێزەر سەوز لە هەموو هێرشێکدا پێشتان دەکەوت و شمشێری بەدەستەوە بوو، سەربازانی ئێمەی بەڕاست و چەپدا تەفر و تونا دەکردن.

ئەمە مانای ئەوەیە کە خوای باڵادەست هەروەك چۆن فریشتەیەکی بەڕێزی ڕاسپارد بوو لەبری سەردارمان حەزرەتی موصعەبی کوڕی عومەیر (خوا لێی ڕازی بێت) بجەنگێت پاش شەهید بوونی لە جەنگی ئوحوددا[1]، هەرچۆن خوای بەتوانا جەنگ و مەعرەکەی سەردارمان حەزرەتی حەمزە (خوا لێی ڕازی بێت) تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەهێڵێتەوە، هەروەهاش کارەکانی سلێمان پاشا بەردەوام دەکات کە ویستی ناوی پێغەمبەری سەردارمانﷺ تا ئەوکاتەی مردیش بگەیەنێتە ناو جەرگە و دڵی ئەورووپا ، چونکە شەهیدەکان بە دەقی قورئانی پیرۆز زیندون و نامرن.

هەروەها(هاملتۆن) سەرۆکی سوپای بەریتانیا لە شەڕەکانی(قەڵای چناق)دا گوتبوی: ئێمە لە ترسی نێزە و تفەنگەکان ڕامان نەکردوە، بەڵکو لەبەر ئەو لاوە تازە پێگەیشتوانەی کە مێزەری سەوزیان لەسەر بوو، گوللەی تۆپ و تفەنگەکانی ئێمە کاری لێ نەدەکردن، ئەو ئازاو نەبەردانەی هاملتۆن باسی کردبوون ئەوانە ڕۆحی شەهیدەکان بوو...

---

١- الطبقات الكبرى، لابن سعد، ٣/١٢١، المغازي، للواقدي ١/١٣٤.

ئەوانەی هەمیشە و هەردەم زینـدوون و گەیشـتوونەتە پلـەو مەرتەبـەی نەمریی.

بەڵێ، دوای ئەوەی ئیماندار رازی بوو بـە سـەربەرزی بمرێـت، ئـەو سـەربەرزییە تـا ڕۆژی قیامـەت بـەردەوام وەك بەیـداخێك دەشـەكێتەوە بەناوی ئەو دینەی كە ئیمانی پێهێناوە.

بەڵێ مردنێكی لەم جۆرە كەس پێی ناگات جگە لەو كەسەی ژیانی لەلا بێبایەخە و لـەڕووی مردنـدا زەردەخەنـە دەنوێنێـت، هـەروەك ئـەو پاڵەوان و مەردانەی كە نەوەی پاڵەوان بوون... جیهاد بەشی ئەو پاك و پیرۆزانەیـە كـە بـە پـاكی لـە دایـك بـوون، ئیـدی شـكۆ و عیززەتـی نەتەوەكـەیان بەشـی گڵكـۆی ئـەوان ناكـات بـەڵكو لـە دڵـی ئوممـەتی ئیسلامیدا دەنێژرێن.

خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾﴾ البقرة: ١٥٤.

بەڵێ ئەگەر پەردە لە سەر چاوەكان لابدرایە ئەو كات دەزانـرا كـە لـە چ خۆشـیەكدان. خـۆ ئەگـەر بكرایـە پەیوەنـدی بـە ڕۆحەكانیانـەوە بكرێـت و گفتوگۆیـان لەگـەڵ بكرێـت دەبینـرا كـە چـۆن دەگـرین بـۆ زیندووەكان. ئێمە بە دوای شەهیدەكاندا دەگرین و دڵمان پڕ دەبێ بـۆ منداڵەكانیان كە هەتیو كەوتوون، بەڵام ئەوان دەگرین بـۆ ئـەو دنیایـەی كە بووەتە بتێك و جگە لە خوا دەپەرسترێت. دەگـرین بـۆ ئـەو ژیانـەی كە بە نەرم و ناسكی دەگوزەرێ و جێی دڵخۆشیتانە، بەڵام بە ڕیسوایی

و نەهامەتی پێچراوەتەوە. هەروەها دەگرین بۆ پاڵدانەوە و وازهێنانتان لە جیهاد کردن لە ڕێگەی خوادا.. بۆ تەمبەڵی لە فەرماندان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە و بۆ ئەو شەوانەی بە تاریکی بە سەرتان دا دەگوزەرێت ، هەروەها دەگرین بۆ ئەو جێ سوجدانەی کە بە وشکی دەمێننەوە و بە ئەسرینی زۆر تەڕ نابن و، بۆ مانەوەی ئەم بارودۆخە ئازاراویەی مەسوڵمانان. لە ڕاستیدا شەهیدەکان لە ژیانێکدان پڕە لە بە ختەوەری و دڵنیایی، ئەی ئەوان هەموو ساتێك لەگەڵ خوای گەورەدا نین؟ ئایا ئەم ژیانەی ئێمە دەیگوزەرێنین دۆزەخ ئاسا نیە گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ئەو ژیانە هەمیشەییەی ئەوان! ئەم ژیانەی کە بووەتە هۆکارێك بۆ هاتنە ژوورەوەی شەیتان تاوەکو لە خوای بالادەست دوورمان بخاتەوە، ئەمە ژیانێکە گریان و شینی دەوێ، بەرگەگرتنی وەها ژیانێك زۆر سەختە، بەلام لەوە بە ئازار تر ئەوەیە ئێمە بە هەڵپە و ویست و ئارەزووی خۆمان ئەم ژیانە بەسەردەبەین.

# بەشی سێیەم

## پەیوەندی (جیهاد-ئیماندار- بونەوە)

### ١- جیهاد واجبی هەموو ئیماندارێکە

بێگومان هەموو یەکێك کارێکی لەسەرشانەو لەم ژیانەی دنیادا – کە هیچ شتێك تیایدا جێگیر نییە– ئەرکێکی پێ سپێرراوە. ماڵ و سامان کۆتایی دێت و کۆشك و تەلارەکان دەبنە کەلاوە و، هیچ شتێك دادی مرۆڤ نادات ئەوە نەبێت لێرەوە بۆ ئەو دنیای دەنێرێت.کەواتە لەسەر مرۆڤ پێویستە کە لە کاری بەردەوامدا بێت و هەوڵ و کۆشش بدات تاوەکو بەر لەوەی بڕوات توێشویەك بۆ ئەویَ پێش بخات.

هەروەك دەبێ ئەوەش بزانرێت: کە نامەی کردەوەکانی مرۆڤ بە مردنی دادەخرێت، خۆی چی کردبێت هەر ئەوەی چنگ دەکەوێت، هەموومرۆڤەکان بەم جۆرەن و کەس لەمە بەدەر نی یە ، مەگەر کەسێك کە بەرگری لە ئایین و ئوممەت و ناموس و شەرەف و گشت ئەو شتانە کردبێت کە پێویستە بەرگریان لیَ بکرێت. ئەوانەی کە خۆیان نەزر کردووە بۆ خوا و ئەوەی لە توانایاندا بێ لەو ڕێیەدا بەختی دەکەن بۆ بڵاو بوونەوەی ئیسلامی مەزن، هەرگیز نامەی کردەوەکانیان داناخرێت،

فەرمودەیەکی شەریف بەجوانی ئەمەی روون کردۆتەوە و دەفەرمویٚ:(كل ميت يختم على عمله الا المرابط، فأنه ينمو لـه عملـه الى يوم القيامة ويؤمن من فتان القبر) ( هەموو مردویەك مۆر لە کردەوەکانی دەدریت و تۆمارەکەی دادەخرێت جگە لە ئێشکگر، ئەو کردەوەکانی بۆ زیاد دەکرێن و لە گەشەدا دەبن تارۆژی قیامەت و، لە فیتنەی قەبریش پارێزراو دەبێت). لە ڕاستیدا ئەو رەویە و سوننەتێکی باشی داهێناوە و ڕێڕەوێکی کردوەتەوە بۆ خەیر و چاکە، لەبەر ئەوەی ئەوانەی دوای ئەو هەر کردەوەیەکی چاك ئەنجام دەدەن لەنامەی کردەوە چاکەکانی ئەودا دەنوسرێن و، لە فیتنە و سزای گۆڕ پارێزراو دەبێت، چونکە لە راستیدا ئەو نەمردووە تاسزای گۆڕ ببینێت، بەڵکو تەنها جێگۆڕکێی کردووە لە جێیەك بۆ جێیەکی تر، بەهۆی ئەو کردەوە و ئاکارە بەرزانەشی کە جێی هێشتوون هەمووکات لەدڵی خەڵکیدا دەژی .

ئەوەی دەڵێت محەممەدﷺ خەلیفەکانی راشدین و ئەصحابەی کیرام (خوا لێیان ڕازی بێت) مردون و کۆتاییان هاتووە، لەراستیدا ئەو کەسە خۆی مردووە، چونکە ئەوان چەند سوننەت و رەویە و ڕێڕەوی جوان و گەورەیان داهێناوە. ڕێگەی رووناکی وایان خستۆتە سەر پشت کە لە هەر ڕێگەیەکی ئەم ژیانەماندا بەرەو بڵندی سەرکەوین جێگەدەست و شوێنەواری تایبەت بە ئەوان دەبینین. کاتێکیش ئەو شوێنەوارانەمان بینی سوجدەی سوپاسگوزاری دەبەین بۆ خوا و دەڵێین: خوای مەزن یادتان بەرز راگریٚ و لەهەمووتان رازی بێت،

بەراستی ڕێگەی بەرەو لای خواتـان بـۆ ئێمـە ئاسـان کـردووە. تـاوەکو بەهێمنی و دڵئارامی پیایدا گوزەر بکەین.

هەر بۆیە کردەوە چاك و پەسەند و ئاکار و تایبەتکاریەکانیان زیاد دەکەن و بڵنـد دەبنـەوە تادەگەنـە عەرشـی ئـەعزەم. بێگومـان ئەمانـە لەسـزای گـۆڕ ترسـیان نابێـت ، چـونکە ئـەم سـزایە تایبەتـە بـە مردوەکانەوە. بەڵێ، سزای گۆڕ بۆ ئەو ڕۆح مردوو و لـەش پەروەرانەیـە کـە ژیانیـان بـە ئـایین ڕەنـگ ڕێـژ نـەکردووە.. ئـەو دینـەی کـە خـودا دایڕشتووە و ڕەنگی بۆ ڕێژاوە.. ئایاکێ هەیە لـەخوا چـاکتر و جـوانتر ڕەنگ ڕێژی بۆ ژیان بکات.؟ ئەوانە سزای گۆڕ دەچێژن کـە ژیانیـان بـۆ حەقیقـەتی ئەحمـەدی تـەرخان نـەکرووە، قورئانیشـیان نـەکردووە بـە دەسـتوری ژیانیـان. بـەڵام ئەوانـەی کـەژیانیان تـەرخانکردووە بـۆ ئـەم ڕاستیانە و کردویانەتە قوربانی ڕێی خودا ئەوانە لە سزای گۆڕ ڕزگـارن. گەورەو سەرداری هەردوو دنیاﷺ لەبارەی جیهادەوە دەفەرموێت: (مـن رابـط ليلـة في سـبيل الله سـبحانه كانـت كـألف ليلـة صـيامها وقيامهـا)[1] (ئەگـەر کەسـێك تـەنها شـەوێك لـەڕێی خـوادا (سـبحانە وتعـالی) ئێشـك بگرێت وەك هەزار شەو وایە کە شەوەکەی بە شەونوێژ بەسەر بردبێت و ڕۆژەکەشی بەڕۆژوو بووبێت). کەواتە پێویستە لە سەرتان کە هەزار ڕۆژ بە ڕۆژو بن و هـەزار شـەو شـەونوێژ بکـەن بـۆ ئـەوەی بگەنـە پاداشـتی کەسێکی ئێشکگر لەیەك شەودا کە لەڕێی خوادا گرتبێتی بەرامبـەر بـەو

---

١- ابن ماجة، الجهاد، ٧.

دوژمنـەی کـە دەیـەوێ بێتـە نـاو وڵاتەکـەتان و ئاسایشـتان تێکبـدات ، بـەڵکو ئەمـەیان خـودا زیـاتر ڕازی دەکـات و لـەلای ئـەو پەسـەندتر و چاکترە .

ئیمانداری وا هەیـە کـە بـە شـێوازێکی ڕێـك و پێـك ئـەرکی جیهـاد جێبەجێ دەکات و ئەو چاکەو بەخشایشانەی کە پێشـتر باسمـان کـردن دەسـگیری دەبـن . هـی واش هەیـە نـاتوانێ بەشـێوەیەکی کرداریـی بەجیهاد هەڵسێ بەڵام بەهۆی چاکە و میهری پـەروەردگارەوە پاداشـتی کردەوەکانی وەك جیهادگەران دەست دەکەوێت. بەو واتایەی لەڕێگـەی ئیمان و قورئاندا کاردەکات و تێدەکۆشێ –بـا بەهـەڵگرتنی بـەردێکیش بێت– بێگومان کارەکەی بەهەدەر ناڕوات .

هەرکەسێك ئەوە بە کێشەی خۆی بزانێت و پـرس و ڕای لـەبارەوە بکات و کاربکات بۆڕاپەڕانـدنی و ببێتـە هۆکـار و فاکتـەری خزمـەتکردن پاداشت دەدرێتەوە . هەر کەس بەپێی نیەتی خۆی پاداشتی کارەکـەی وەردەگرێت. سەرەتا ئـەو نوسـەرەی کـە بەپێنوسـەکەی تێدەکۆشـێ و جیهاد دەکـات تادەگاتـە ئەوکەسـەی کـە بـڵاوی دەکاتـەوە، هـەموویان ئەجرو پاداشتی خۆیان بەبێ کەم وکورتی وەردەگرن.

کەواتە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە لەم سـفرە و خوانـە گەورەیـەدا بـەو توانـاو لێهاتنـەی کـە خـوای گـەورە پێـی بەخشـیوە بەشـداری بکـات تـاوەکو لـەو ئامـانج و بەروبومـەی دەسـت بکـەوێ کـە لەکاری کۆمەڵەوە پەیدا دەبێت .

ئەبوهورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) لەفەرمودەی "شەوڕەویدا" بۆمان دەگێڕێتەوە (...پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت و جوبرەئیلیش(سەلامی خوای لێبێت) لەگەڵیدا ڕۆیشت ، فەرمووی : هاتە لای گەلێگ لە ڕۆژێکدا تۆویان ئەچاند و هەر لەو ڕۆژەشدا دروێنەیان دەکرد و وەك خۆی لێدەهاتەوە . پێغەمبەرﷺ فەرمووی بە جوبرەئیل ئەمە چیە؟ ئەویش فەرموی ئەوانە موجاهید و تێکۆشەر بوون لەڕێی خوادا، کردەوە چاکەکانیان بۆ چەند بارە دەکەنەوە تا حەوت سەد جار ئەوەشی دەیبەخشن خوای گەورە بۆیان هەڵدەگرێت و نافەوتیٚ ، هەرخۆی چاکترین و باشترین ڕۆزی بەخشە)[1].

بە واتایەکی تر کاتێك کە پێغەمبەرﷺ بەو پەرستش و بەندایەتیەی کە هەیبو بۆخوا لە "شەوڕەویەکەیدا" بە یەك بەیەکی ئاسمانەکاندا سەرکەوت و بەرزکرایەوە لەکاتێدا لە جیهانی ئادەمیزاد داماڵراو بۆجیهانی مەلەکوت بڵند بوو، دیمەنی جۆراوجۆری بینی و سەیری تابلۆی زۆریشی کرد، گەل وکۆمەڵێکی بینی کە لە ڕۆژێکدا دەیانچاندو لەهەمان ڕۆژیشدا دروێنەیان دەکرد کاتێك کە بەروبومەکەیان کۆدەکردەوە جارێکی تر تۆوەکان سەوز دەبونەوە و بەری تریان دەگرت، لەو کاتەدا پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە جبریل دەکرد ئەمانە کێن؟.. ئالێرەدا مرۆڤی ئیماندار کاتیٚ هەموو ژیان و چێژەکانی و حەوانەوە و لاویەتی خۆی لەپێناوی خوا و لەڕێی خوادا بەخت دەکات

---

١- تفسیر القرأن العظیم لابن کثیره/٣١.

دەبێ بزانێ کە هەروا بە هەدەرو خۆڕایی ناڕۆن و لەنێوناچن بەڵکو کاتێك کۆچ دەکات بۆجیهانەکەی تر ، زۆر بەدڵنیاییەوە دەڕوات و لەوێ دەبینێ کە تەنها گەردیلەیەکیش لە کردەوەکانی بە هەدەر نەچوون. بەڵێ، خوای گەورە پارێزەر و چاودێرە بەسەر هەموو شتێکدا و، پارێزگاری لەو شتانە دەکات کە ئیماندار لە پێناوی ئەو و لەرێی ئەودا بەختی دەکات. بەڵێ، خوای گەورە کردارەکانی ئیماندار دەپارێزێت و بە باشترین شێوە پاداشتی دەداتەوە. خۆ ئەگەر لە بەهەشتدا سوجدە بردن هەبێت –گەر بچێتە سوجدەوە بۆ خوا– هەتا ئەبەد سەر بەرز نەکاتەوە و ناتوانێت سوپاس و شوکری خوا تەواو بکات لەسەر ئەو میهرەبانیە گشتی و بەخششانەی کە رژاندبوونی بەسەریدا. بەبڕوای من ئەو تام و چێژە رۆحیەی لەم سوجدەیەدا بە دەست دێت هیچی لە تام و چێژەکانی بەهەشت کەمتر نی یە.

پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا ئەم بەشداربوونەی لە بەرەوبوومی جیهاددا روونکردۆتەوە بەوەی کە دەفەرموێت:(من جهز غازيا فی سبيل الله فقد غزا ومن خلف غازيا فی سبيل الله بخير فقد غزا)[1] (هەرکەسێك لەرێی خوادا پێداویستیەکانی موجاهید و تێکۆشەرێك ئامادە بکات ئەوە جیهادی کردووە، ئەوەیش لەرێی خوادا ئاگای لە ماڵو منداڵی تێکۆشەرێك بێت وچاك بێ لەگەڵیان ئەوە جیهادی کردووە) بەڵێ، ئەوەی ناتوانێت بەشداری لە خودی جیهاددا بکات خۆ

---

١– البخاری، الجهاد، ١٣٨، الترمذی، فضائل الجهاد،٦ ، النسائی، الجهاد، ٤٤ .

دەتوانێت یارمەتی ئەوانە بدات کە جیهاد دەکەن و، تێکۆشەر و موجاهیدانی بەهۆی دام و دەزگاکانیەوە لەئامێز بگرێت و بیانپارێزێت، ئەو کەسە بەشێوەیەکی کردەیی و پراکتیکی لە جیهاددایە و لەگەڵیاندایە، ئەوانەی یارمەتی موجاهید و تێکۆشەرانی "بەدر" یاندا و ئەوانەش موجاهیدانی "ئوحود"یان بەڕێ کردن و ماڵ و سامانیان تەرخانکرد بۆ موجاهیدانی "تەبوك" هەر هەموو پێکەوە بەرەو لای پەروەردگاری بەرز و بڵند دەڕۆن و پێکەوە حەشر دەکرێن. ئەوانە لە جیهاد دوا نەکەوتوون چونکە وەڵامی فەرمانی خوا و پێغەمبەریان داوەتەوە و بەدەم بانگی جیهادەوە چوون، با بە شێوەیەکی کرداریش لەگەڵ تێکۆشەر و جیهادگەراندا -لەبەر هەر هۆو بیانویەك کە هەیانبوو- بەشداریان نەکردبێت.

بەڵی، ئەوانەی کە چوون بۆ جیهاد بۆ "تەبوك" لەرۆژی قیامەتدا هاوسەر و منداڵ و پیر و لاوەکانیان دەبینن کە لەگەڵیانن. چونکە منداڵەکانیان چەقۆ و قەمەکانیان هاورد و لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ دایاننان.. هەروەها بوکەکانیان هاتن خشڵ و زێڕ و زیوەکانیان هێنا، تەنانەت پیاوە ئەختیار و بەتەمەنەکانیان ئەو داردەستانەی کە هەیانبوو هێنانیان... هەر کەس هەرچیەکی هەبوو دەیبەخشی بە خوا و لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ دایدەنا و، دەیانگوت: بائێمەش بەشداربین لە جیهاددا. ئا ئەوانە هەر هەموویان حیسابی کەسێکیان لەگەڵ دەکرێت کە تێکۆشابێت و جیهادێکی کرداری ئەنجام دابێت.

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ لە فەرمودەیەکی تردا ئەمە دەخاتە ڕوو:( ان بالمدینة لرجالا ماسرتم مسیرا ولا قطعتم وادیا الا کانوا معکم حبسهم المرض)[1] لە ریوایەتێکی تردا (الا شارکوکم فی الاجر) بەواتای: ئەو بڕو بیانوانەی وەك پیری و کەنەفتی و نەداری و، ئافرەتبوون و ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەبەستنەوە لە بەشداری کردنی کردەیی، لە ئەجرو پاداشتی ئەو کەسانە کەم ناکات، بۆیە خوای تەعالا وەك موجاهیدی گۆڕەپان پێشوازیان لێ دەکات و بەپێی نیەتیان پاداشتی کردەوەکانیان دەداتەوە، ئێمە بەم جۆرە لەم مزگێنیەی پێغەمبەری سەردارمانﷺ تێدەگەین کە لە فەرمودەکەی پێشودا هاتووە. وا دادەنێین ئەم ئیمان و باوەڕەشمان –هەروەك لە فەرمودە پیرۆزەکەدا هاتووە– جۆرە نزایەك بێت بۆمان، بەتایبەت لەم کاتەدا کە بەتەواوی واز لە جیهاد هێنراوە. ئێمە دڵنیاین و لەو باوەڕەداین کە هەر کەسێك بە هەندەکی(جزئی) یان هەمەکی (کللی) لەم کارەدا بەشدار بێت – کە خزمەتکردنی ئیمان و قورئانە – پاداشتی جیهادی بەتەواوی دەسگیر دەبێت، داوا لە پەروەردگاری بە بەزەیی و میهرەبانیش دەکەین لەم متمانە و یەقینەماندا نائومێدمان نەکات.

## ٢- با هەمیشەو هەردەم ئامادەی جیهاد بین

پێویستە ئیمانداران بەردەوام لە ئامادەبوونێکی تەواودا بن بەرامبەر بەو مەترسیانەی لەمەودوا دێن و ڕوو بە ڕوویان دەبنەوە،

---

١– مسلم، الامارة، ١٥٩، البخاری، المغازی، ٨١.

هەرچـی تەندروسـتی و لاویـەتیان هەیـە بـەختی بکـەن لـەم ڕێگایـەدا، هەروەها پێویستە لەسەریان ژیانیان بەشێوازێك ڕێك بخـەن لـە بـەردەم ئەو ڕووداوانەی کە دێنە کایەوە، بۆ ئەوەی نەکەونە ناو تەنگ و چەڵەمە و شلۆقیەوە چونکە ئەوکاتە دووچاری دڵەڕاوکێ و شـڵەژان دەبـن و بـە دەستیانەوە گرفتاردەبن.

قورئانی پیرۆز بەم ئایەتە پیرۆزە هانمان دەدات بۆ ئەم ڕاستیە: ﴿ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ٦٠ ﴾ الأنفال: ٦٠، واتـە: (ئـەوەی لـە تواناتاندا هەیە لە ئەسبابی هێز و سەرکەوتن ئامادەی بکەن بۆ جـەنگی کافران، وەك شیر و تیر و زرێو تـاس کـڵاو و چـەکی هـەر ڕۆژێ بـەپێی ئـەو ڕۆژە، هــەروەها ئەسـپی بەسـتراوەی ئامــادە بـۆ سـواری، تــا دوژمنــەکانی خــوا و خۆتــانی پــێ بترسـێنن، دوژمنــی تــریش وەکــو مونافیقان و دوژمنی دوور، کە ئێوە نایانناسن و خودا ئەیانناسـێ. بـێ گومان هەرچی لە ڕێگای خودا و ئایینی ئیسلامدا صەرف بکەن خودا لـە ڕۆژی قیامەتـدا پاداشـیتان ئەداتــەوەو، ئێــوە هــەرگیز سـتەمتان لێ ناکرێت).

پێغەمبەرﷺ فەرمانمان پێدەدات: (مَنْ أَحْتَبَسَ فَرساً فِي سَبِيلِ اللهِ إِيمَاناً بِاللهِ وَ تَصْدِيقاً بِوَعْدِهِ فَإِنّ شِبَعَهُ وَرِيّهُ وَرَوثَهُ وَبَوْلَهُ فِي مِيزَانِهِ يـوم

القيامة)[1]، واتە: (هەركەسێك ئەسپێك دابەستێت لەپێناو خوادا و، بـڕوا و متمانەی تەواویشی بـە بـەڵێن و پاداشـتی خواهـەبێ، ئـەوا ئالیـك دان و گەوڕ ماڵینەكەی دەچێتە سەر ترازوی كردارە چاكەكانی قیامەتی).

فەرمودە پیرۆزەكە بەم شێوازە گونجاوە هاندانمان دەدات خۆمان ئامـادە بكـەین بـۆ جیهـاد، هـەروەها كاتێـك ئەصـحابە بـەڕێزەكان پرسیاریان لە پێغەمبەرﷺ كرد فەرموی: (الخَيْـلُ لِثلاَثـةٍ: لِرَجُـلٍ أجْـرٌ، وَ لِرَجُلٌ سِتْرٌ، وَلِرَجُلٌ وِزْرٌ، فأمّا الذي لَهُ أجْـرٌ فَرَجُـلٌ رَبَطَهَـا فِـي سَبِيلِ الله فَأطَالَ فِي مَرْجٍ أوْ رَوْضَةٍ فَمَا أصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذلكَ مِنَ المَرجِ أوِ الرّوضَـةِ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٌ، وَلَو أنّهَا قَطَعَت طِيَلَهَا، فَاستَنّت شَرَفاً أو شَرَفينِ، كانَت أروَاثُهَا وَآثارُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ، وَلَو أنّها مَرّتْ بِنَهرٍ فَشَرِبَتْ مِنـهُ وَلَـم يُـرِدْ أنْ يَسقِيَهَا كَانَ ذلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ، وَأمّا الرّجُلُ الـذِي هِـيَ عَلَيـهِ وِزرٌ فَهـوَ رَجـلٌ رَبَطهَا فَخراً ورِياءً وَنِواءً لأهلِ الإسلامِ فَهِيَ وِزْرٌ عَلَى ذلِكَ)[2].

لە فەرمودەكـەدا باسـی ئەسـپ كـراوە چـونكە خێراتـرین هۆكـاری گواستنەوە و جەنگ بووە لەو سەردەمەدا، بەڵام ئێستا سەردەم گۆڕاوە و خەڵكی ئوتۆمبیل و هۆكارەكانی تری وەك كەرەسـتەی گواسـتنەوە و جـەنگ بـەكار دێـنن ، لەبـەر ئـەوە دەكـرێ ئـەم بڕیـارەی لـە بـارەی ئەسـپەوە هـاتووە هۆكارەكـانی گواسـتنەوەی ئـەم كاتـەی ئێسـتاش بگرنەوە. بەڵێ، جاری وا دەبێ ئۆتۆمبیلێك دەبێتە گوناهو ئۆباڵ بەسەر

---

١- البخاري، الجهاد، ٤٥، المسند للإمام أحمد ٣/٣٧٤.

٢- البخاري، الجهاد، ٤٨، الترمزي، فضائل الجهاد، ١٠.

خاوەنەکەیەوە، چونکە خاوەنەکەی لە خراپە و تاواندا بەکاری دێنێت، یان ئەگونجێ بیکاتە هۆکارێك بۆ دژایەتی ئیسلام. ئۆتۆمبیلێکیش دەبێتە قەڵغان بۆخاوەنەکەی و لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێت چونکە لەکاری ڕەوادا بەکاری دەهێنێت، لەوانەیە ببێتە هۆکاری ڕۆزی و بژێوی بەڵام مافی خوای لە بیر ناچێت تیایدا. ئۆتۆمبیلێکیش لەڕێی خوا بەخشراوە و نەزر کراوە، خاوەنەکەی دەگوێزێتەوە لە گوندێ بۆ گوندیکی تر و لەگەڵ خۆیدا ڕابەر و ئامۆژگاران دەگەیەنێتە ئەو شوێنانەی کە پێویستیان پێیەتی، هەموو دڵۆپێکی سوتەمەنی کە دەیسوتێنێ و، هەموو درهەمێك کە تیایدا خەرج دەکرێت ، تا دەگاتە ئەو دوکەڵە بێکەڵکەی کە لێی دەردەچێت، هەروەها ئەو دەنگانەی لێی پەیدا دەبن و، ئەو قوڕەی بە تایەکانیەوە دەنوسێت... هەموو ئەمانە دەبنە چاکە و لە نامەی کردەوە چاکەکانی خاوەنەکەیدا دەنوسرێن، هەروەك بزوتنی تایەکانی چەشنی چەرخەکانی کارگەیەکی گەورە، خێر و چاکە پەیدا بکەن و تۆماری بکەن، هەرچی تێدەچێت و لێی دەردەچێت، بگرە ئەو شوێنەوارانەی لەسەر زەویەکەدا دەردەکەون، فەرمانی پێنوسێك دەبینێت کە بەردەوام چاکە بنوسێت. ئێمە بەوپەڕی ڕێزو پێزانینەوە کاری ئەو بەختەوەرە دەنرخێنین کە ئۆتۆمبیلەکەی تەرخان کردووە بۆ خزمەتی ئیمان و قورئان و، قورسی بانگەوازی حەقی خستوەتە سەرشانی و زمان حاڵی دەڵێت: ئامانجم لە کڕینی ئەم ئوتۆمبیلە بڵاوکردنەوەی ڕاستیەکانە. ئیتر پێویست بە باسکردن و

ناساندن ناکات، ئەمە خۆ ئامادەکردن و ئامادەبوون و پێشەکیە بۆ کاری زۆر گەورە کە بە فەرمانی خوای بالادەست لە داهاتودا دێتە دی.

**٣- ئیماندار لە هەموو کات وساتێکدا بە جیهاد کامڵ دەبێت**

بێگومان جیهادی مادی و مەعنەوی گەورەترین پاڵنەر و دەستورە لە ژیانی موسڵماندا، ئەگەر لە ئیمانداردا ڕۆحی جیهاد و جیهاد کوژایەوە و خامۆش بوو ، هێدی هێدی عەشقی ئیمان و ئیسلام دەکوژێتەوە، ئەوکات پزیسکی ئاشوب لە هەموو لاوە دەورەی دەدات، بگرە بڵێسەی ئاگرەکەی بەر دەکەوێت . فیتنە و ئاشوبیش بەردەوام بەدوای یەکدا دێن، تا لە کۆتاییدا ماڵی ئەوکەسانە و شوێنکار و کۆلان و بازاڕەکانیان دەبێتە هێلانەی نەفرەت و خراپە، ئیتر وای لێ دێت لە بەردەم ڕووداوە ترسناکەکاندا لاواز دەبێت و هەرەس دێنێت، ئیتر دەماری مەردایەتی بۆ هیچ کار و ڕووداوێك لێ نادات و هەستی نابزوێ.

بەئەندازەی کەمبوونەوەی حەز و تاسەی جیهاد لە دڵەکاندا فەڕ و بەرەکەتی نیگا (وەحی) کەم دەبێتەوە، ئەوکاتەش تاسە و شەیدایی بۆ دەرك کردنی مەبەستە پیرۆزەکانی خواوەند نامێنێت و دڵەکان دوور دەکەونەوە و نامۆ دەبن لەوەی ببنە جێگەی ئیلهامی پەروەردگار، پاشان لە ڕاز و نهێنیەکانی خواوەند بێبەش دەبن. دەی ڕۆژی ئەوانە وەك شەوەکەیان تاریکە چونکە خوای گەورە (سبحانەوتعالى) لێشاوی درەوشانەوەکانی خۆی بە دڵی ئەو کەسانە دەبەخشێ کە کۆڵی جیهاد هەڵدەگرن و، لە ئاستی بڵند ڕاگرتنی وشەی (الله) دا دەبن بە جۆرێك

که بگونجێت لەگەڵ گەورەییەکەیدا، ئیتر ئەو کۆمەڵگەیەی ئەمانەی تێیدا دەژین نابێتە کەلاوەو زبڵدان.

بەڵێ، تەواوی و کاملی تاك و خێزان و کۆمەڵگە تێکڕا پەیوەستە بەو هەوڵ و جیهادەی ئەدرێ لە پێناو بەرزکردنەوەی کەلیمەی خودا لەناو ژیان و کۆمەڵدا، ئەگەر ئیمانداران شتێك لە هەوڵ و هیمەت پێشکەش بکەن، بەوەی لە گوندە دوورە دەستەکاندا بگەڕێن، دێ بە دێ و شار بە شار بانگەوازی حەقی خوا بە خەڵکی بگەیەنن، ئەمە مانای ئەوەیە خوای گەورە ئەم کۆمەڵگەیە لە هەموو بوارەکاندا زیندو دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر کۆمەڵگە لەم گیان و هەستە بێبەش بوو ، بێگومان ئەو کۆمەڵگە دەڕمێ بەسەر سەری تاکەکانیدا، ئیتر ئەمڕۆ بێت یان سبەی یان دوو سبەی، ئەوەی چاوەڕێی دەکات نزیکە. مێژوو شاهیدە چەندین دەستەڵاتدار و خاوەن پلە و پایە ڕیسوا بوون و، چەندین سەرمایەدار هەژار کەوتوون کاتێ وازیان لە جیهاد هێنا، ئەوانەی تاجی پاشایەتیان لەسەردەنا دوای ئەوەی ڕۆژگار گۆڕا سەرشۆڕ و ڕیسوابوون و ناچاری قاچ ماچکردن بوون. ئێمە ئەمڕۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە دەخوێنینەوە بەسەریاندا: ﴿كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾﴾ الدخان: ٢٥ – ٢٧. لەوانەیە ڕۆژێك بێت –خوا بمانپارێزێت– خەڵکیش هەر خودی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەسەر ئێمەدا بخوێنێتەوە !

بەڵێ سورەتی(الفاتحه) خوێندرا بۆ گیانی ئەمەوی و عەباسی و سەلجوقی و عوسمانیەکان. ئەگەر نامانەوێ ئەنادۆڵ – کۆتا قەڵای ئیسلام بەرامبەر بە ڕۆژئاوا – ببێتە گۆڕستان و، تیایدا(الفاتحه)مان بۆ دابخەن پێویستە دوور بکەوینەوە لەو بارو شێوازەی کە مردووەکان و خەڵکی گۆڕستانەکانی تێکەوتووە بەو مانایەی ژیانێك بەسەر بەرین کە شیاو و گونجاو بێت بۆ مرۆڤ–.

چەندێك دینی خوا بە گەورە بزانین، ئێمەش گەورە دەبین، چەندە ناوی پیرۆزی خودامان لەلا بەرز و بڵند بێت ئەوەندە قەدر و ڕێزمان لەلای خودا دەست دەکەوێت، بەڵام ئەگەر بە سوك سەیری کارەکەمان کرد و ئەرکی خۆمانمان لە بانگەوزا و گەیاندنی پەیامی خوداییدا پشت گوێ خست و وازمان لە فەرمانبەرداریەکەمان هێنا، بەو رادەیە لەبەردەم خوادا بچوك دەبینەوە و تێك دەشکێین و تیادەچین.

ئەگەر بەڕاستی دەمانەوێت بە سەربەرزی بژین، پێویستە لەسەرمان ناوی خودای گەورە لە قووڵایی دڵماندا جێگیر بکەین، خودای گەورە بکەینە مەبەستی ژیانمان، هەرچیەك کە پەیوندی بە خوداوە نیە لە ژیانماندا بگرە لە خەو و ئەندێشەماندا لایبەرین، هەموو بڵێین : ئەو گۆڕەی کە داڵانی دوا ڕۆژە بۆمن چاکترە لە ژیانێك کە نەتوانم خودام خۆش بوێت تیایداو، نەتوانم بانگەوزەکەی بگەیەنم و فەرمانەکانی جێبەجێ بکەم لە ژیانمدا. مردنم چاکترە لەوەی کە هەڵگری دڵێك بم نەکرێتەوە بۆ درەوشانەوەی سیفەتەکانی خوای باڵادەست، تاوەکو

چلك و چەپەڵیەكانم بشواتەوە... تێبكۆشن بۆ زیندو كردنەوەی ئەم هەستە بەرز و بیرۆكە پاكە لە دڵی هەموو ئوممەتدا، پاش ئەوەی كە كۆمەڵگە زۆرێك لە پاڵپشتەكانی ڕماون هەوڵ بدەن كە جارێكی تر لە سەر پێی خۆی ڕاوەستێ، بۆ ئەوەی پەروەردگارمان ڕزگارمان بكات و نەبینە رانی بێ شوان.

ئیماندار دەزانێ چی پێش دەخات و فەزڵی دەدات بە سەر شتانی ترداو بۆچی پێشی دەخات، ئەویش بە پێی ئەو هەڵسەنگاندنەی كە پێویستە بیكات لە نێوان دنیاو پاشە ڕۆژدا. لە ویژدانیدا هەست بە گرنگی پاشەڕۆژ دەكات و پێشی دەخات بەسەر كاروبارەكانی دنیای فانیدا ، ئەو هەمیشە ئامادەیە كە فەرمانی خودا پێش كاروبارەكانی دنیای بخات، بەپێی ئەم پێوەرە قوربانی نادرێت بە كاروبار و شتە هەمیشەییەكان لەبەر خاتری كاروبارێكی بێ ئەرزش، بەڵكو گرنگی بە دنیا دەدات بەئەندازەی مانەوەی تیایدا و گرنگی بە دواڕۆژیش دەدات بەگوێرەی مانەوەی تیایدا، ئیدی ناكەوێتە ناو زێدەڕۆیی (إفراط) ی جولەكە و گوێنەدانی (تفریط)ی گاورەكانەوە.

ئیماندار سەركزی بەرامبەر كاروبارە دنیاییەكان بە هەنگاوی یەكەم دادەنێت بۆ تووشبوون بە ڕیسوایی و سەرشۆڕی دواڕۆژ، چونكە ئەوانەی كە دنیا دەكەنە گەورەترین خەم و پەژارە و ئەوپەڕی ئاواتیان، لەگەڵ ئەوەی دواڕۆژیان لە دەست دەچێت لە دنیاش بێبەش دەبن. ئەوەی لە مردن دەترسێت چێژی ژیانی لە كیس دەچێت، هەروەها

ئەوەش لەبەردەم دوژمندا و لەبەرەکانی جەنگدا ژێری لەدەست دەدات و لە ترسی ژیان و شەیدایی بۆ ئەم ژیانە پشت لە دوژمن دەکات، یا لەبەر خاتری بژێوی و ژیانی خۆی هێندە دڵەڕاوکێ و دوو دڵی ڕووی تێدەکات ناچاردەبێت لە مەیدانی جیهاددا هەڵبێ ، لە خودی ژیان و بژێوی بێبەش دەبێت. تەنانەت ئەو کەسەی دەچێتە خەڵوەتگەکەی تاکو دنیا و شتە دنیاییەکانی لەدەس نەچێ و، لە جیهادی پیرۆز خۆی دوا دەخات لەو خەڵوەتگەش بێ بەش دەبێت. ئەوانەی کە بێ هیممەتن ڕۆژێك دێت کە هەرچییەکیان هەیە لە دەستیان بچێت و سەرەونخون ببنەوە، بەڵام مرۆڤە هیممەت بەرزەکان کە ئامانج و مەبەستیان ئەوەیە بوونەوەر بە ئەستێرە و هەسارەکانیشیەوە ئاوەدان بکەنەوە، دنیا بەکەم تەماشا دەکەن و ڕازی نابن کە جیهان ببینن دوو فەرمانڕەوا بیبەن بەڕێوە، بەڵکو خۆیان بە شیاوتر دەزانن، ئیدی بە درێژایی تەمەنیان خەو بە فەرمانڕەوایی جیهانەوە دەبینن.

بەڵێ ئەوانەی مردن پێش دەخەن بەسەر ژیاندا، بێگومان نهێنی نەمریان بۆ دەرکەوتووە و ڕێگەیان بۆ ژیانی هەتاهەتایی دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەوانەی بە جوانیەکانی دنیا مەدهۆش و خەڵەتاون، بە هەرچی هێزو توانایانە چنگی لێ گیر دەکەن و دەسبەرداری فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە دەبن، ئەوەی پێویستە لەسەریان لەم بوارەدا پشت گوێی دەخەن، ئەمانە میللەت بەرە و تیاچوون دەبەن و سەرباری خۆیان نەوەکانی داهاتوو دەدەنە دەست تیاچوون و سەرگەردانی و بە

بێ خاوەن و پارێزگار بە جێیان دەهێڵن. لابردن و ڕەواندنـەوەی تـەمی ئەم چارەنوسە ترسناکە بەندە بە جیهادی ئیمانـدارەوە.. بـەڵێ شـەقام و کۆڵانـەکان بـە جیهـادی ئیمانـدار ڕوونـاك دەبنـەوە، ئـەم ئـاڵۆزی و تۆقاندنەی دنیای نوقم کردووە لە دەریـای خوێنـدا، تـەنها بـە جیهـادی ئیماندار نامێنێت و، ئاشتی بەردەوام و هەمیشەیی بۆ گشت مرۆڤایـەتی و بەختەوەری لەسەر زەویدا بە جیهادی ئیماندار دادەمەزرێت. ئیمانـدار ئەو مرۆڤەیە کە بەرەو ئەم ئامانجـە بـەرزە کەوتۆتـە ڕێ، لەوانەیـە بـەم ئامانجـەی بگـات یـان نـا، بـەڵام لـە هـەردوو بارەکـەدا سـۆزی خـودای میهرەبـان لـە ئـامێزی دەگرێـت و لەگـەڵ بەختـەوەران و ئـەو کەسـە چاکانەدا حەشر دەکرێت کە ژیانیان لە ڕێی ئەم بانگەوازەدا بەخشـیوە و دەستیان بە بەزەیی و میهری فراوانی خوداوە گرتووە.ئـەوەی نابێـت لە یادی بکـەین ئـەم ڕاستیەیە: پێویسـتە لەسـەر ئیمانـدار کـە ڕێگـەی ڕاست(حق) بگرێت و لەسەری دامەزراو بێت، بەڵام مەرج نیە هەموو کات بەمەبەست بگات، چونکە مەرج نییە هەموو کەس بگاتە ئامانج شـتی وا لە ئارادا نی یە، لە هـەمان کاتـدا لەسـەر هـەموو کەسـێك پێویسـتە کـە هەستان و دانیشتنی، هەروەها کاروبار و جیهاد و هەوڵ و کۆششـی بـۆ گەیشتن بە ئامانج بێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە بە دەستهێنانی ڕەزامەنـدی خودا لەم ڕێیەدا ئاسان نابێت مەگەر کەسێك کە خودا کۆمەکی بکات.

بـەڵێ، ئـەو شـتەی دڵـی "غـازی عوسمـان"ی نیگـەران کردبـوو و چـەندین سـاڵی دوور و درێـژ غـەم و پـەژارەی بـوو، لەسـەر دەسـتی

نەوەكانیـدا هاتـە دی. گـەورەیی هـەر هـەنگاوێك كـە سـوڵتان لـە دوای سوڵتان دەینا بەپێی ئەو ئامانجە بوو كەلێوەی بەرهەم دەهات . لـەلای خوای باڵادەستیش هەر هەمان گرنگی هەبوو. كردارەكانیان هەر هەموو بریتی بوون جیهاد ، گشت ئەوانەش كە لەم جیهادەدا لەگەڵیان بەشـدار بوون لە تۆمارگەی موجاهیدەكاندا تۆمـار دەكـرێن. بـەڵێ، هـەر كـەس چووە سەر پشـتی وڵاخەكـەی و ئەسـپەكەی ئامـادە كـرد و كەوانەكـەی هەڵگرت و خۆی ئامادەی رۆیشـتن كـرد بـۆ وڵاتـی كـافران بـۆ تـەبلیغ و گەیاندنی بانگەوازی ئیسلام لە تۆمارگـەی موجاهیدەكانـدا نـاوی تۆمـار دەكرێت. ئیتر جیاوازی ناكرێت لەنێوان ئەواندا و ئەو فەرمانڕەوایەی لـە گۆڕەپاندا دەجەنگێت ، هەروەها جیاوازیان نابێـت لەگـەڵ ئەوكەسـەی لەسەردەمی فەرمانڕوایی و دەسەڵاتداری خۆیدا لە دەریاوە بـۆ دەریـای خسـتە ژێردەسـەڵات و فـەرمانڕەوایی خـۆی و كردیـە یـەك و، بـوو بـە رەگەزی هاوسەنگی لەسەر زەویدا تا وای لێهات كە دراو(سـكە) بـەناوی ئەوەوە لێبدرێت، چونكە هەموو یەكێكیان هـەمان حەقیقـەتی مەبەسـت بوو و هەوڵی بۆ دەدا و بە ئاڕاستەی ئەو كاری دەكرد.

بەڵێ، ئـەو دنیایـەی كـە فیـداكارانی مەحەببـەت دروسـتی دەكـەن بێگومان دەبێتە بناغەی سەكینەت و سەرچاوەی ئـارامی و چـەقی ئـەو ئاشـتیەی كـە هـەموو مرۆڤایـەتی دەگرێتـەوە. هـەر هـەنگاوێكیش لـەم بوارەدا بۆ دروستكردنی ئەم جۆرە دنیایـە بنرێـت هـەنگاوێكی پـیرۆزە، هەر هیممەتێكیش لەم رێیـەدا پێشـكەش بكرێـت بـا زۆر بچـوكیش بێـت

گەورە و مەزنە، جا ئەگەر لە تواناتاندایە با تەنها یەك هەنگاویش بێ بینێن پێش ئەوەی كە هەناسەكانتان ببڕێن و هەنگاوتان بۆ نەنرێت... بۆ گەیشتن بە خوای گەورە لەگەڵ مەلائیكەتە بەڕێزەكاندا پێشبڕكێ بكەن تاخوای باڵادەست سەربەرزتان بكات و بۆ لای خۆی بڵندتان بكاتەوە، جا ئەگەر پێش تەواوبوونی پێشبڕكێكە گەڕاندنیەوە بۆ لای خۆی، بێگومان ئەوە مانای سەرفراز بوونە... بەڵێ لای ئەو تەنها دەنكە خەرتەلەیەكیش لە كردار بزر نابێت.سەرنجی ئەو مانایە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بدە: ﴿ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ ﴾ النساء: ١٠٠، واتە: (هەر كەس وڵاتی خۆی بەجێ بێڵێ لە پێناوی یارمەتی دانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا وكۆچ بكات، ئەوە ئارامگای باش و شوێنی حەسانەوەی زۆری لەسەر زەوی دەست دەكەوێ و، ژیانی ئەكەوێتە خۆشی و لە تەنگانەیی و دەست كورتی رزگار دەبێ....).

لەوانەیە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە زیاتر مەسەلەكە ڕوون بكاتەوە:

دڵەكان لە تاسە و ئەوینی ئیمان بە خوادا دەقرچان. خەڵكیش وردە وردە بەرەو كانگای فەیزی ئیلاهی لە مەدینەی مونەوەرەدا كۆمەڵ كۆمەڵ و تاك تاك دەهاتن، تا ئەو رادەیەی كە بەربەستەكانی نێوان دڵەكان توانەوە و هەموان لە مەدینەی مونەوەرەدا دەچونە

خزمـەت پێغەمبـەری خۆشەویسـتﷺ، بگـره دوژمنـه سەرسـەختەکانی پێشوو بوونه دۆست و هاوەڵ.. یـەکێك لەوانـه جونـدوبی کـوڕی زومـره بوو، ئەو وتی : پێویسته بچم بۆ مەدینـه.. لـه نێـوان کافرەکانـدا خـۆی دەرباز کرد و رووی کرده مەدینەی مونەوەره، هەر لە دوورەوە هەستی به بۆن و بەرامەی مەدینه دەکرد..بەڵام توشی نەخۆشـییەکی زۆر گـران بـوو نـەیتوانی بـڕوات و کـۆچ بکـات، بـەم جـۆره نـەیتوانی بگاتـه مەبەستەکەی..کاتێك هەستی کرد سەره مەرگی نزیکه هەردوو دەسـتی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە و بـەدڵێکی سـوتاوەوە وتـی: خوایـه گیـان دەسـتێکم بۆدەسـتی تـۆ و دەسـتەکەی دیـم بۆدەسـتی پێغەمبـەری خۆشەویستﷺ قبوڵ بکە، وا من بەوێنەی ئەو بەیعەتەی رەسـول اللهﷺ بەیعەتم پێدای...ئیتر پێش ئـەوەی بگاتـه مەدینـه کۆچـی دوایـی کـرد. رووداوەکەیان بۆ پێغەمبەرﷺ باس کرد. هەندێ لـه هـاوەڵان وتیـان کـه جوندوب به کۆچەر "موهاجیر" دانانرێت و پاداشتی کۆچـەریانی نییـە.[1] ئەم ئایەته پیرۆزه دابەزی کـه جونـدب لـه کۆچـەریەکانه. هەرکەسیش بەنیازی هیجـرەت بـۆ لای خـوای باڵادەسـت مـاڵی خـۆی جێبێڵـێ و لـه رێگەدا بمرێ پاداشتی موهاجیری دەست دەکەوێت.

بەڵێ، رێبواری رێی حەق، لەسەر حەقه، ئـەوەش دەتگەێنێتـه لای حەق، وەك ئەو حەقـه. بـەڵێ، لەوانەیـه بـۆ گشـت کـەس نـەگونجێ کـه بگاتـه کەعبـەی شـەریف و بەدەوریـدا تـەواف بکـات و، سـەلام لـه

---

١- أسد الغابة لابن الاثیر١/٤١٢-٤١٣.الدر المنثور للسیوطی٢/٦٥٠-٦٥٤.

"حەجەرول ئەسوەد" بکات و ماچی بکات، پاشان بچێتە عەرەفە و لەگوناهەکانی پاك بێتەوە. بەڵام هەر کەس عاشقی ئەم ڕێبازە بێت و رەفتاری پێ بکات و، خەم و خولیای بەدەوری ئەودا بسوڕێتەوە، خوای باڵادەست و بە بەزەیی و میهرەبان دەستبەرداری نابێت و ئەو دڵە عاشق و پەرێشانە بەسەرگەردانی ناهێڵێتەوە و بێبەشی ناکات لە پاداشت.ئەو کارانەی کە بۆ خوا دەکرێن جیاوازی لە نێوان گەورە و بچوکیاندا نییە. با ئەوانەش کە دەڵێن: من ناتوانم بەو جۆرەی کە ئێوە باسی جیهاد دەکەن جیهاد بکەم و ناشتوانم بگەمە ئەومەسەلانە، ئەوەندە سەروەت و سامانی زۆریشم نیە لەرێی خوادا بیبەخشم... هاوشێوەی ئەم برو بیانوانە ... با ئەوانە چاك بزانن هەرکەس لەم سفرە و خوانە خواییەدا بە هێندەی کەوچکە چایەکیش بەشداربێت – بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت– دەگاتە ئەجر و پاداشتی ئەوانەی پڕی دۆڵ و دەریایەك بەشداریان کردبێت.

بەڵێ، مادام کارەکە بۆ خوایە سەیری گەورە و بچوکیی ناکرێت، ئەگونجێ کارێك بەئەندازەی گەردیلەیەك بێت لەرێی خوادا چاکتربێت لە چەندین تەن لە کردار، لەوانەیە تاکە هەنگاوێك لەم رێیەدا ئەوەندە خێرو بێر لەگەڵ خۆی بێنێت کە دوارۆژی مرۆڤی پێ ئاوەدان بێتەوە، بۆیە پێویستە کاتێك کارێك بۆ خوا ئەنجام دەدەن نیەتتان ساغ وپاك بکەنەوە. هەرچی لە تواناتاندایە بەکاری بێنن و هەرکارێکیش لە

تواناتاندایـە ئـەنجامی بـدەن، بـا هـیچ گومانێـك رووتـان تێنـەكات كـە عینایەت و چاودێری خودا لەگەڵ ئێوەدایە.

## ٤- ڕەببانیەكان فەرمانڕەوا دەبن

ئـەو جیهـادەی كـە لـە حـەزرەتی ئـادەم پێغەمبـەرەوە (سـەلامی خوای لێبێت) دەستی پێكردووە و پێغەمبەرەكانی تر درێژەیان پێداوە، سەدەها لە پیاوانی خـودا كـە لای ئێمـە ناسـراون یـان نـا، بـە درێـژایی مێژوو لە كاتە جیا جیاكاندا درێژەیان بەو ڕێگایە داوە ، قورئانی پـیرۆز بەم ئایەتە پیرۆزانە فێری ئـەم ڕاسـتیەمان دەكـات: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ آل عمران: ١٤٦ – ١٤، ئایەتە پیرۆزەكە باسی ئەو پیاوانە دەكات كە ژیان و هەموو چێژەكانی دنیا و هەرشـتێك پەیوەندی بە دنیاوە هەبێت بە كەم بۆی دەڕوانن ، ئەوان بە شـەو و بـە ڕۆژ لە پێناو گەیشتن بە ڕەزامەنـدی خـوادا ئۆقرەیـان لێ بـڕاوە، لـەڕێی ئـەودا هـەموو شـتێكی گـران بـەهاو خۆشەویسـتێك بـەخت دەكـەن، بەردەوام بە سرودی هەق دەڵێنەوە، زمانیـان بـە یـادی خـودای بـەرز و بڵند پاراوە ، ئەوان پەیوەندیان بە خودای خۆیانەوە زۆر توند و تۆڵـە و جیهادیان لە كرۆكی دڵیانـەوە هەڵدەقوڵێ... بـەڵێ ئەمـە جیهـادی ئـەو

رەببانیانەیە کە بەو کۆسپ و ئاستەنگانەی دێنە ڕێیـان ناپسـێن و لاواز نابن. هیچ شتێك کاریان تێ ناکات ئەگەر چی ئاسمان بەسەریاندا بڕمێت و زەویش شەقبەرێت و قوتیان بدات و، بـەلا و ناخۆشـیەکان دەورەیـان بدەن و بەسەریاندا داباربن. ئەوان لە سەر ڕێگـەی خۆیـان بـەردەوامن و گوێ بە بەلاو موسیبەتەکان نادەن، هیچ شتێکی گەورە و گران بازویـان ناپسێنێ و، بەرەو پێشـەوە چـوونیان لـەو ڕێگـە حەقـەی کـە ئیمانیـان پێیەتی رێیان لێ ناگرێت، ئەوان پاڵـەوانی ئـارامگر و پیـاوی دامـەزراون. ئـارام گـرتن لـە فیترەتیانـدا چـێنراوە و بگـرە لای ئـەوان ئـارام گـرتن بوەتە حەز و تاسە . ئەم تاسە و حەزە گرنگترین هۆکارە بـۆ بەدەسـت هێنانی بەزەیی خودا. چونکە خودا ئارامگرانی خۆش دەوێت. لەلایـەکی ترەوە لە پاکی و پاکژیدا پێشبڕکێ لەگەڵ فریشتەکاندا دەکەن، رەفتـار و شێوازی پێغەمبەران دەکەنـە سەرمەشـقیان بـۆ دوورکەوتنـەوەیان لـە گوناهو تاوان، ئەوان دەزانن کە گوناهو تاوان و دڵ ڕەقی، مرۆڤ توشی داڕمان و کـەم ورەیـی و دۆڕان و نـا جـێگیری دەکـات، لەبـەر ئـەوە لـە ژیاندا لە عـەزم و لێـبڕان و دامـەزراوی و پێشـڕەویدا بـەردەوام دەبـن و هەموو کات پەنا بە خودا دەگرن و بۆ گوناهو لادانیـان لـە کارەکانیانـدا داوای لێخۆش بوونی لێ دەکەن.بەڵێ، تاوان بە هەموو واتاکانیەوە ڕێگر و بەربەستە لە بەردەم دابەزینی سۆز و بـەزەیی خواوەنـد، لەبـەر ئـەوە پێویستە دەست بەجێ تەوبە لە گوناهو تاوان بکرێت، دەگونجـێ لەبـەر ئەمە بێت تەوبە و داوای لێخۆش بوون لەم ئایەتە پیرۆزەدا پێش خراوە

بەسـەر سـەرکەوتندا: ﴿......رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤٨﴾﴾آل عمران. قورئانی پیرۆز ڕێگەیەکی ڕاست و ڕێکمـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە بـۆ بەدەسـت هێنـانی خۆشەویسـتی و ڕەزامەندی خودا، ئـەو ڕێنماییمـان دەکـات و دەفـەرموێ: ئەگـەر ئێـوە ئەوەتان دەوێت ئـا ئـەوە ڕێگەکەیـە... ببنـە ڕەببـانی و پیـاوی خـودا. لێرەوە هەموو پێغەمبەرێك لە ناو ئوممەتەکەیدا ئـەم مرۆڤـە ڕەببانیانـە پەروەردە دەکات، کـە نوێنەرایـەتی بانگەوازەکـەی دەکـەن و بەیـداخی جیهادیـان پێدەسـپێرێ. هـەموو پێغەمبـەرێك کـەم تـا زۆر کەسـانی ڕەببانی لەم جۆرانەی هەبووە.بـەم شـێوەیە ئـەم سوننەتەی خواوەنـد بەردەوام بوو تا گەیشتە پێغەمبەری ئازیزمان، ئەو ئازیزە ئەوانەی ئـەو پێیگەیاندن لـە ئەصـحابەی کـیرام هـەموویان ڕەببـانی بـوون، هـەروەك هەموو هاوەڵێك سومبول و هێمای جیهاد و پاڵـەوانی و دامـەزراوی بـوو، هـەر ئەصـحابەیەك بگریـت وەك حەواریـەك وابـوو، ئـەوان لـە هـەموو زاهیـدەکان زاهیـد تربـوون، بەشـەو لـە هـەموو خوداپەرسـتان زیـاتر خوداپەرسـتیان دەکـرد، بـەڕۆژ دەبونـە پاڵـەوان، تەنانـەت ترسـیان دەخسـتە نـاو دڵـی شـێرە دڕندەکانـەوە، بـەهێزترین سـوپای مـەزن لەبەردەمیاندا دەهات بە چۆکداو وەك منـداڵی بچوك لـە دەسـتیان ڕای دەکرد، چونکە ئەوان عاشقی مردن بوون، لە کاتێکدا دوژمنـەکانیان لـە

ترسی مردن ڕایان دەکرد و لە مردن دەتۆقان. با ئێستە هەندێك نمونە لە چاکترین سەردەمدا بهێنینەوە:

## أ- ئەنەسی کوڕی نەزر

لە جەنگی بەدردا بەشداری نەکردووە، هەموو خێزانەکەی بە قافڵەی نوور گەیشتون، خۆیشی بە نوور گەیشت و بووە نوورێکی پرشنگدار، ڕێگەی نووری گرت بۆ بڵاوکردنەوەی نووری حەقیقەت... بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا لەبەر چەند هۆکارێك کە لە توانای خۆی بەدەر بوون بەشداربونی لە بەدردا بە نسیب نەبوو، ئەمەی زۆر پێ ناخۆش بوو بەردەوام بە غەم و ئازارەوە دەتلایەوە، بەتایبەتی کاتێك کە شێرەکانی بەدر لە غەزا گەڕانەوە لە داخانا بە دەستی دەیکێشا بە ئەژنۆیدا و دەیوت:( یا رسول اللهﷺ لە یەکەم جەنگدا کە دژی بتپەرستان کردت بەشدار نەبووم، ئەگەر خودا تەمەنی دامێ بۆ جەنگی موشریکین مەگەر خودا بزانێ چی دەکەم)[1].

دوای تێپەڕبوونی یەك ساڵ قورەیش بۆ تۆڵە سەندنەوەی بەدر بە هێزێکی چەند جارەی هێزی موسڵمانەکان هاتن و گەیشتنە دەرگاکانی مەدینەی مونەوەرە، لەسەر چیای ئوحود جێگیر بوون، کە لە مەدینەوە نزیکەی پێێنج کیلۆمەتر دوور بوو.ئەنەسی کوڕی نەزر (خوا لێی ڕازی بێت) کە پێشتر بەشداری جەنگی بەدری بەنسیب نەبوو، ئێستا بە

---

١- (یارسول الله غِبتُ عَن أوّلِ قتالٍ قاتَلتَ المشرِكينَ لَئِنِ اللهُ أشهَدَني قِتالَ المُشرِكِينَ لَيَرَيَنّ الله مَا أصنَعُ) البخاري، تفسيرسورة الأحزاب(٣٣)١٤٦، مسلم، الإمارة، ١٤٨.

هەموو هێزو توانا و هیمەت بەرزیەکەوە هاتووە بۆ جەنگی ئوحود، کاتێك کە جەنگ کڵپەی سەند بەڕاست و چەپدا هەڵدەسوڕا هەر کافرێك دەهاتە بەردەستی لە ملی دەدا، لە پێناوی بەرز بوونەوە و گەیاندنی وشەی (الله) دا لە هەموو جێگەیەکدا هێرشی دەکردە سەر مردن، خەریك بوو جەنگ کۆتایی دەهات، ئەنەس خەمبار بوو، چونکە شەهادەتی بە دەست نەهێناوە، ئالەم کاتەدا خالیدی کوڕی وەلید هێرشێکی کتوپڕی هێنایە سەر موسڵمانەکان، بەمەش پشێوی رووی کردە ڕیزی موسڵمانەکان و پڕوپاگەندەی کوژرانی پێغەمبەری خواﷺ بڵاوبوویەوە، ئەمەش بووە هۆی پشێوی زیاتر لە ناو ڕیزی موسڵمانەکاندا، بەڵام تاکە کەسێك کە لە پێشەوەدا مایەوە و یەك پێ بەرە و دواوە نەگەڕایەوە ئەنەس بوو، خۆی ئەدایە بەر دوژمن و دەیوت ئەگەر ڕاست بێت کە ڕەسول اللهﷺ شەهید بووە و وەفاتی کردووە ئەی ئێوە ژیانتان بۆچیە؟ ...ئەنەس عاشقی شەهیدی و تاسەمەندی بادەی شەرابی مردن بوو.. دەستی بەرزکردەوە و وتی: (خودایە من داوای لێبوردن دەکەم و پۆزشت دێنمەوە لەوەی کە ئەمانە دەیکەن – واتە هاوەڵەکانی – هەروەها پەنات پێ دەگرم لەوەی کە ئەوانە –واتە موشریکین– دەیکەن)[1].

---

١– (اللَّهُمَ إنّي أعتَذِرُ إليكَ مِمّا صَنَعَ هَؤُلاءِ يَعني أصحابَهُ وَأبْرأُ إليكَ مِمّا صَنَعَ هَؤُلاءِ يَعني المُشرِكينَ) البخاري، تفسيرسورة الأحزاب(٣٣)١٤٦، مسلم، الإمارة، ١٤٨.

بەڵێ ئەنەس پەنای بە خودا گرت و خۆی بە دوورگرت لەوەی کە ئەوانە دەیانکرد و خۆی خستە پەنای خودای موتەعال.پاشان سەرنجێکی تێکچونی شیرازەی موسڵمانەکانی دا سەبارەت بەو دیمەنە زۆر ئازار بەخشە چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك ، ڕاستە هێشتا دوژمن دەستی نەگەیشتوەتە ئەوان بەڵام ئەم دیمەنی ڕیز تێك چوون و شڵەژان و پەرت و بڵاویەیان وەك تیرێکی ژەهراوی وایە و سنگی پێکابێت و وتی: (خوایە من داوای لێبوردن دەکەم لەم کارەی ئەمانە....) ئیدی بەبێ ئەوەی ساتێك بوەستێ هێرشی بردە سەر ڕیزی دوژمن و تەنها یەك ساتیش ترس بە ئەندێشەیدا نەدەهات و وشەی ترس لە فەرهەنگی بیرکردنەوەیدا نەبوو، چونکە لای ئەو مردن خۆشەویستر بوو لە ژیان.

جارێکی تر جەنگ کڵپەی سەند و لەگەڵ ئەو هەموو ڕوداوانەدا سەرئەنجام بە قازانجی موسڵمانەکان گەڕا، چونکە دوژمن مەیدانی جەنگی جێ هێشت و بەخۆی و تفاقی جەنگەوە پشتی هەڵکرد.

ژمارەی شەهیدانی ئوحود نزیکەی حەفتا شەهید بوون، ئەنەسی کوڕی نەزر(خوا لێی رازی بێت) لە نێوانیاندا بوو، سەیریان کرد زیاتر لە هەشتا برینی شمشێر و لێدانی ڕم و بەرکەوتنی تیری پێوە بوو، بەڕادەیەك کە خوشکەکەی وتی: (گەر پەنجەکانی نەبوونایە براکەمم نەدەناسیەوە)، لەکۆتاییدا بە پلەی شەهیدی گەیشت، قورئانی پیرۆز لەم ئایەتە پیرۆزەدا باسی ئەم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون بەم جۆرە باسیان دەکات: ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ

نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب: ٢٣: (لەناو موسولمانانا پیاوانێ هەن راستیان کردووە لەو گوفتەدا کە بەخوا و پێغەمبەری خوایان داوە. جا هی وایان هەیە بەو عەهد و پەیمانەوە مردوون هی واشیان هەیە ماون و چاوەڕێی ئەو ڕۆژەن لەڕێی خوادا شەهید ئەکرێن و عەهد و پەیمانی خۆیان نەگۆڕیوە بەگۆڕین). ئەنەسی کوڕی نەزر لەو پیاوانە بوو کە ئەو بەڵێن و پەیمانەی دابوویان بە خودای خۆیان بردیانە سەر.

## ب- بەڕائی کوڕی مالیك

هەرچەندە بەڕائی کوڕی مالیك پاڵەوانێکی بێ وێنە بوو و لەجەنگەکانیشدا جێ دەستی دیار بوو، بەڵام حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی رازی بێت) سەرکردایەتی سوپای پێ نەدەسپارد، کاتێك پرسیاریان لە هۆکارەکەی کرد، فەرموی: (لەبەر ئازایەتی و چاونەترسیەکەیەتی).

بەڵێ، ئەوەندە بوێر و چاو نەترس بوو لەوانە بوو کە هەموو سوپا توشی تیاچوون بکات، هێندەش هێرشی دەبرد و بەرە و پێشەوە دەچوو، گەورەمان حەزرەتی عومەر(خوا لێی رازی بێت) هەرچەندە زۆری خۆش دەویست سەرکردایەتی سوپای پێ نەدەسپارد ، لە ترسی ئەوەی نەکا ئەم چاوقایمیەی وای لێبکات کە پابەندی خۆپاریزی (الحذر) نەبێت.ئەمە ئەو بەڕائی کوڕی مالیکە بوو کە ترسی نە دەناسی، بەشداری هەموو غەزاکانی کردوە و لەملی کافرانی داوە و لە

هەموو ڕووبەڕووبونەویەکدا چاوەڕێی شەهیدی دەکرد، گەر لە مەیدانی جەنگدا پێی نەگەیشتبا بەخەمباری دەگەڕایەوە.

لە یەمامەدا بە ئەندازەی (قاب قوسین) یان نزیک تر لە شەهادەت نزیک بوەوە، لە کاتێکدا ئەستەم بوو کە دەرگای قەڵاکە بکرێتەوە، ئەو بەسەر شوراکەدا سەرکەوت و خۆی هەڵدایە ناو قەڵاکەوە و دوژمن تیر بارانیان کرد، لە چەندین لاوە پێکراو برینەکانی کاریگەربوون ، بەڵام ئەوەی ئەو دەیویست لە یەمامەدا پێی نەگەیشت.

ئەو یەکێك بوو لەو ئەصحابانەی دوعایان گیرا دەبوو، پێغەمبەرﷺ لە نێوان کۆمەڵێ لە ئەصحابەکاندا ستایشی کرد، (كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لَا يُؤْبَهُ لَهُ لَو أَقسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ، مِنهُمُ البَرَاءُ بنُ مَالِكٍ)[1]، (چەند کەسی قژ دژراو و تۆز و غوباراوی و جلوبەرگ کۆن و دڕاو کە خەڵکی بایەخێکی پێ نادەن، بەڵام ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات – کە کارێکی بۆ جێبەجێ بکات– خودا بێ دڵی ناکات، بەرائی کوڕی مالیکیش یەکێکە لەو کەسانە).

ئەصحابەی کیرام ئەگەر کارێکیان لەلا گران و قورس بوایە پەنایان دەبردە بەر بەڕائی کوڕی مالیك(خوا لێی ڕازی بێت) تا دوعایان بۆ بکات. ئەم ڕووداوەش لە ئەهوازداو، لە جەنگی نێوان موسڵمان و فارسەکاندا ڕوویدا، لەکاتێکدا پشێوی کەوتە ڕیزی موسڵمانەکان خەڵکی چاوەڕێی بەڕائی کوڕی مالیکیان دەکرد دوعای سەرکەوتنیان بۆ بکات،

---

١– الترمزي، المناقب ٥٤، ابن ماجه، الزهد ٤.

ئەویش دەستی هەڵبڕی و وتی :( خوایە گیان دوژمن بشکێنە و سەرمان بخە بەسەریاندا و بە پێغەمبەرەکەتﷺ شاد بکە) لەو کاتەدا هەزارەها لە موسڵمانەکان ئەم دوعایەیان لەگەڵدا گوتەوە و بۆ گیرا بوونی ئەم دوعایە (ئامین، ئامین) یان دەکرد ، ئنجا بۆ دواجار بە چاوەکانی سەیری (ئەنەس) ی کرد کە برای بوو لەبەر خوا ، لە خۆشی و شادمانیدا وەك بریسکەی هەور تیشکێکیان دەدایەوە، دەست بەجێ قەڵغانەکەی فڕێ داو شمشێری راکێشاو چووە ناو ڕیزی دوژمن.. خوای گەورە دوژمنانی شکست پێهێنا و موسڵمانەکانی سەرخست، کاتێك شادی لە ناو موسڵمانەکاندا بڵاو بوویەوە سەیریان کرد وا شێرێکی هێرش بەر لەمەیدانی جەنگدا برینداره و، بەرزەردەخەنەیەکی ناسك سەیری ئەو دیمەنە دەکات... ئەوە دیمەنی ماڵ ئاواییە لە دنیا، دیمەنی سەرکەوتنە، بۆ دواجار پێڵوی چاوی لەسەر دادەخات، ئەو شێرە برینداره بەڕائی کوڕی مالیك بوو(خوا لێی رازی بێت) ، چاوەڕێی بەشەکەی تری دوعاکەی بوو، ئەویش گەیشتنی بوو بە پێغەمبەری خوداﷺ، ئەوە بوو دوای کەمێك گەیشتە ڕەسول اللهﷺ کە لە خودی خۆی خۆشتری دەویست.

## ٥- جیهاد ڕێی گەیشتنە بەفەرمانڕەوایی لەسەر زەویدا

ئیماندار پەڕاوێکی بە دەستەوەیە نە لە مەوپێش و نە لەمەودوا بەتاڵ و ناڕەوا نەیتوانیوە توخنی بکەوێت، کە ئەمەش بەڵێنی خودایە، ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگەی ڕاست و هیدایەت، هەر ئەوە سەرچاوەی

سەربەرزی و پایە بەرزی ئیماندار. هەروەها پێشەنگو پێشەوای گرۆی ئادەمیزادی لەبەردەمدایە کە چاوی لێبکات، ئەویش گەورە و سەرداری پێغەمبەرانەﷺ، بەڵێ ئیماندار بەو کتێبە ڕوون و پێغەمبەرە ئازیزەی زیاتر لە هەر کەسیکی تر لەسەر زەویدا خاوەنی بەخت و بەخششێکی گەورەیە، ، لەبەر ئەوەیە ئەو تاکە پاڵێوراوە تاوەکو فەرمانڕەوای هەموو سەرزەوی بێت. قورئانی پیرۆز ئەم چەمکە فێری ئیماندار دەکات و، خودای گەورەش ئەم ئەنجامەی لیٚ چاوەڕێ دەکات.

ئیماندار ئەو کەسەیە کە هەمیشە ئەم وشانە دووبارە دەکاتەوە: (الله پەروەدگارمە و محەممەدﷺ پێغەمبەرمە و قورئان کتێبمە و جیهاد لە ڕێی خودا بەرزترین ئاواتمە)، لەبەر ئەوەیە لە کرۆکی دڵیدا ئەم چەمکە جێگیردەبێت: لەسەرم پێویستە کە لە ئوممەتی ئیسلامدا ڕەگەزی هاوسەنگی لە نێوان هەموو ئوممەتەکانی سەرزەویدا دروست بکەم. ئەگەر گوفتارەکەم سەنگ و کاریگەری سەرەکی نەبێت لە سەر ئەو بڕیارانەی کە بۆ چینەکانی مرۆڤایەتی دەدرێن، ئەو کاتە ستەم گەلێکی ئابڕووبەرانە ئەنجام دەدرێت، سەربەرز و خاوەنشکۆکان ڕیسوا دەکرێن و ڕیسواو سەر شۆڕەکانیش دەکرێنە فەرمانڕەوا، لەبەر ئەوە پێویستە بڕیار و فەرمانەکان لە منەوە دەربچن و من ببمە ڕەگەزی هاوسەنگبوون، پێویستە لەسەر وڵاتان لە کۆنفراسەکانیاندا سەیری پەنجەی من بکەن و، بزانن ئاماژە بۆ کویٚ دەکەم، قسەم پێش بخرێت

بەسەر قسەی تردا کە لێرە و لەوێ دەکرێت و، هیچ بڕیارێك دەرنەکرێت تا ڕاو بۆچونی من وەرنەگیرێت لەو بابەتەدا.

کاتێك ئیماندار گەیشتە ئەم هەست و تێگەیشتنە، ئیدی هیچ هێزێکی داگیرکەر موسڵمانان بەکار ناهێنن بۆ بەرژەوندیەکانی خۆیان و هیچ بڕیارێکی ئابلۆقەدان لە دژیان دەرناکرێت، ئەمەیە خوای گەورە لە ئیمانداری دەوێت و دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ (١٠٥) ﴾ الأنبياء: ١٠٥، ذکر: واتە ئامۆژگاری، بەڵام لێرەدا بەمانای تەورات هاتووە، یان واتایەکی فراوانتر بە(لوح المحفوظ) دێت، بەواتایەکی تر دەتوانین ئەم ئایەتە پیرۆزە بەم جۆرە ڕوون بکەینەوە: خوای گەورە پاش ئەوەی هەرچیەك هەبوو لە(لوح المحفوظ) دا نوسی لەو پەیام و نامانەی کە ناردی بۆ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێبێت) هەندێك لە ئیستنساخی(لوح المحفوظ)ی بۆ ناردن ئەویش ئەوە بوو کە: بەندە ڕاست و سوڵحاوەکانی خوا میراتی سەر زەوی دەبەن، واتە بەندە سالح و چاك خوازەکان میرات گری ڕاستەقینەی سەر زەوین، بەڵام فەرمانڕەوایی خەڵکانی تر لە سەر زەویدا کاتی و بە سەر چووە، چونکە فەرمانڕەوایی بەردەوام لە سەر زەویدا نوێ بووەوە هی بەندە دڵسۆز و چاك خوازەکانە و، ئەوەی لەوان پێکدێت لە نەتەوە و کۆمەڵگەی چاك خواز و بۆ خواسوڵحاوەکان. بێگومان ئەم دەستورە لە(لوح المحفوظ)دا بڕیاری لەسەر دراوە، لە زەبوریشدا تۆمار کراوە کە لەو نەقڵ کراوە ، بەڵێ ئەو

زەبورەی بۆ پێغەمبەر داود(سەلامی خوای لێبێت) هاتوە و دەستکاری نەکراوە، ئەم دەستورەی تێدایە.

بەڵێ، ئەگونجێ لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا دەستورو پرۆگرام دەربکەون -کە خوا پێیان ڕازی نەبێت- چەندکەسی یاخی و سەرکەشی وەك فیرعەون لێرە و لەوێ و لە هەموو شوێنێك دەرکەون، بەڵام بۆ کاتێکی دیاری کراو و لە کات و ساتێکی کەمدا، ئەمە نەیاری نییە لەگەڵ ئەو دەستورە گشتیەی کە لە(لوح المحفوظ) و زەبوردا نوسراوە، کە قورئانی پیرۆز هەواڵی پێداوە. چونکە ئەو میراتگرەی باس کراوە مەبەستی میراتگری هەمیشەیی و فەرمانڕەوایی بەردەوامە و بۆ ماوەیەکی درێژە، بەڵام دەرکەوتنی فەرمانڕەوایی خراپکار و نالەبار جارو بارو بۆ ماوەیەکی کورت، بەندە بە دانایەتی خوای گەورە و، بۆ بە ئاگا هاتنەوەی موسڵمانان و بیرخستنەوەیان کە دەسپێشخەری بکەن و لە نێو خۆیاندا یەك بگرن ، ئەوە دەستورێکی خواییە و هیچ کەس ناتوانێ بیگۆڕێت.

خاوەن ڕەوشتە جوان و بالاکان لە سەردەمی خۆیاندا یان ئەوانەی کە بەشێکی زۆریان لەو خووڕەوشتانەدا هەیە، ئەوانن دەبنە فەرمانڕەوای سەر زەوی، ئەوەی جێی سەرنجە مەبەست لە خوڕەوشتە بەرز و جوانەکان تەنها هاتوو چۆی مزگەوت نیە، یان هاوشێوەی ئەو کردەوانە، بەڵکو خۆ ڕازاندنەوەیە بە ئاکارە بەرز و جوانەکانی پێغەمبەرﷺ لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، هەر بەم ڕەوشتانەیە مرۆڤ

واتای شتەکان و ڕووداو و پەیوەندی مرۆڤ بە بوونەوەرەوە دەزانێت. هەر بەم ڕەوشتە بەرز و جوانانە دەکرێت پارێزگاری لە هاوسەنگیەکی تەواو لە قوڵاییەکانی دەرون و قوڵاییەکانی دەوروبەر و ئاسۆدا بکرێت، بەمانەیەکی فراوانتر چاك خوازانی سەر زەوی هەمیشە پاڵێوراون بۆ گەیشتن بە ئەمری.

ناگونجێ ئەم واتا فراوانەی فەرمانڕەوایەتیە ئەوانە بیهێننەدی کە هانی تیرۆر و پشێوی دەدەن لە هەموو لایەکی جیهاندا و تاوان لە دوای تاوان ئەنجام دەدەن و لە بێ ئاگایی خەڵك کەڵك وەردەگرن –بە تایبەت گەنجان– بە گیروگرفتی سیاسیەوە سەرقاڵیان دەکەن و، دروشمی سیاسی دادەتاشن بۆ بەدەست هێنانی ڕای جەماوەر و، هەر ژێری خۆیان لا پەسەندە و لە نێوان خۆیاندا راوێژ (شورا)یان پشت گوێ خستوە... هەرگیز ئەمانە ناتوانن ئەم فەرمانڕەواییە لەسەر زەویدا –بە واتا ڕاستەقینەکەی– بەرپا بکەن، ڕۆژێ لە ڕۆژان و لە کاتی هەڵهاتنی خۆری ئیسلامدا، لەو بێ ئاگاییەیان بێدار دەبنەوە و، لەو کاتەدا پەشیمان دەبنەوە چونکە دەزانن کەوتونەتە ناو تاریکیەکی زۆر چڕەوەو دان بەهەڵەکانیاندا دەنێن.

بێگومان ئەو مرۆڤەی خوا دروستی کرد و ڕێزی لێنا، ڕۆژێ دادێ ڕاستەڕێ دەدۆزێتەوە، گەر وانەبێ ئەو دەستورە بەهەڵە دەردەچێت – پەنا بە خودا– وەك زانراویشە ﴿لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ﴾ الروم: ٣٠، دەستورێکە و ناگۆڕێت، بەڵام خوای گەورە دەستورێکی تری هەیە ئەویش: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ

لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ ﴾ الرعـد: ١١. خـوای گـەورە ئوممـەتێکی بەرزو خاوەن شکۆ کە تـاجی سـەر بوو بێـت، ڕیسوا ناکـات مەگـەر ئـەو ئوممەتە لە ناوەوە بگۆڕێن و خراپ ببن، ئەم دەستورە لە مانـا ئیجـابی و سـەلبیەکاندا وەك یـەك کـار دەکـات، کەواتـە پێویسـتە پارێزگـاری دەروون(الـنفس) بکرێـت و هـەوڵی ناسـینی بـدرێت، ئـەوەی دەیـەوێت نازناوی ڕزگارکار(فاتح)ی دەست بکەوێت پێویسـتە یەکـەم جـار قـەڵای نەفسی خۆی فەتح بکات و بچێتە نـاوی، ئـەوەی نـەتوانێ نـاخی خـۆی ڕزگار بکات، لە دەرەوەدا هیچ شتێك بەدەست ناهێنێت.

(بوطرسـی گـەورە) بـە کەللـە ڕەقـی ناسـراوە و، نەخشـەیەکی نمونەیی بۆ ڕوسـەکان کێشـا، ئـەم نەخشـەیە هەمیشـە جـێی بایـەخی ڕوسـەکان بـوو، دەتـوانین لێـرەدا کـورتی بکەینـەوە بەمـەی خـوارەوە: سنوری بەڵقان ببەزێنن، فراوانبوونی عوسمانیەکان ڕاگرن و ڕێگەیان لێ ببڕن، فیتنە و ئاشوب لە ڕیزەکانیاندا بەرپا بکەن، دابەزنـە سـەر دەریـا گەرمـەکان، دەسـت بگـرن بەسـەر ئـەفریقا و میرەکـانی دورگـەی بەسرەدا، ... ڕێگە مەدەن ئەوروپیەکان جیهـانی ئیسـلامی بـەکاربهێنن لە دژتان، با لەگەڵیشیاندا بچنە وتووێژ و ئاشتەواییەوە.

بەگشـتی ئـەوە وەسـیەتەکەی بـوو، ئـەم وەسـیەتە تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان و، بگـرە لەسـەردەمی شیوعیەکانیشـدا بووەتـە ئامـانج و مەبەسـتی ڕوسـەکان. بـەڵام وەسـیەتەکەی ڕەسـولی ئـەعزەمﷺ بـۆ ئیمانداران بریتی یە لە هەستان بە بانگەوازی بەرز و بڵند بۆ مەبەست و

ئامانجێکی گەورە و مەزن، ئەویش فەرمانڕەوایی ئیسلامە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان بە مەبەستی دەستەبەرکردنی بالآدەستی دنیا و دوا ڕۆژ.

بەجێ گەیاندنی ئەم ئەمانەت و سپاردە پیرۆزە و بلآو کردنەوەی لە ئاسۆکانی ئەمڕۆی جیهاندا قەرزێکە و لەگەردنماندایە، دەبێ ئیماندار بە درێژایی ژیانی لەبەر خاتری ئەو ئامانجە بژی و، بۆ گەیاندنی ئەم مەبەستە بگاتە دەریای گەرم و دەریا ساردەکانیش، پێویستە لەمەودوا لە هەموو پارچەیەکی سەر ڕووی زەویدا هەست بەو هێز و فەرمانڕەوایەی بکرێت، با لە بەستەڵەکەکانی سیبریا و شوێنە نادیارەکانی ئەمریکای باشور و بیابانەکانی ئەمریکای باکوریشدا بێت. چونکە خوای گەورە لێی قبولّ ناکات لە ژێر دەستی کافراندا بمێنێتەوە: ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾﴾ النساء: ١٤١. خۆ ئەگەر بەوە ڕازی بوو مانای لەدەست دانی هەموو شتێکیەتی لە ئیسلام و ئیمان. ئیدی مافی ژیانی نابێت. چونکە ژیانی یەکپارچە دەبێت بە سەر شۆڕی و ڕیسوایی و نەهامەتیو دەردیسەری، هەروەها لە دواڕۆژیشدا سەرشۆڕی و ڕیسوایی هەمیشەیی بەشی دەبێت، بۆیە پیرۆزترین هەست و سۆز کە ئیماندار هەیەتی و داکۆکی لەسەر دەکات فەرمانڕەواییەتی گشت سەر زەویە.

ڕۆژگارێکی دوورو درێژ هەبوو ئێمە لەسەر زەویدا فەرمانڕەوا و خاوەن توانا بووین، ئەوەی دوێنێ هاتە دی دەگونجێ سبەینێش بێتە

دی، ئەوەی لەسەر ئێمە پێویستە هەوڵ و جیهاد و کاری بەردەوامە و هیممەت کردنە بۆ ئەو کارە ، یان لانی کەم هیممەتی پیاوە خاوەن بەجەرگەکان بوروژێنین بۆ دانانی چەند ئامانجێك بۆ هێنانە دی ئەم فەرمانڕەواییە.

**أ- فەرمانڕەوایی لای حەزرەتی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوایان لێبێت) و کەسانی پێش ئەویش:**

بێگومان سەردارمان حەزرەتی موسا(سەلامی خوای لێبێت) ئەم ئامانجەی بۆ ئیماندارانی بەنی ئیسرائیل روونکردەوە، کە هەر خۆیشی بەرپرسی پێگەیاندن و پەروەردکردنیان بوو ، بەڵام ئەم کۆمەڵە شایەنی ئەم ئامانجە گەورە نەبوون، چونکە چاویان کوێرو نابینابوو و ، گوێیان کەڕبوو لە ئاست ئەو ڕاستیانەی کە لەو ڕۆحە بەرزەوە هەڵقوڵابوون. ئەو پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێت) بە درەوشانەوەکانی پەروەردگاری شکۆدار لە(طوری سینا) جۆش درابوو، قورئانی پیرۆزیش ئەم هەڵوێستەی ئەوانمان بەم ئایەتە بۆ ڕوون دەکاتەوە: ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ المائدة: ٢٤. ئەم گوتارە ڕوو بە ڕووی پێغەمبەرێکی پایەبەرزی(ئولی عەزم) گوتراوە. بەنی ئیسرائیل بە چەمکی سەر زەمینی وەعدە دراو(الارض الموعود) گەورە بوون و پێگەیشتن... ئێستەش کات لەبارە و هەلیان لەبەردەستدایە گەر هەوڵ و جیهادێك بدەن دەگەنە ئامانجەکەیان، بەڵام ژیانی دونیایان هەڵبژارد و دڵیان پێ خۆشکرد و

پاڵدانەوە و دانیشتنیان لە لا پەسەند بوو، بەجۆرێك لە نیەتیاندا نەبوو لە جێی خۆشیان هەڵسن، لە هەر هەوڵ و كۆششێك دوورە پەرێزیان دەكرد. بێ گومان ئەو شتەی دەیانویست دەستیان بكەێت گرانبەهابوو، بەڵام لەسەر شانیان قورس بوو كە نرخەكەی بدەن، لەبەرە ئەوە حەزرەتی موسا(سەلامی خوای لێبێت) پەنای بردە بەر پەروەردگاری خاوەن شكۆو دەسەڵات، چونكە نەیدەتوانی بە هیچ كارێك هەستێت: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ ﴾ المائدة: ٢٥. هەروەك بڵێ: بەڕاستی بێزار بووم لەمانە، بێهیوا بووم لێیان چونكە گیانیان مردووە و رۆحی جیهادیان تێدا بزر بووە و حەزیان لە حەوانەوە و پاڵدانەوەیە، عەزیمەت و غیرەتیان داڕماوە، منیش داوا لە پەروەردگارم دەكەم و دەڵێم: ئێمە و گەلی یاخی لە فەرمانی خوا جوێ بكەرەوە. خوای باڵادەست بۆ ماوەی چل ساڵ لە بیابانی سەرلێشێواندا وێڵ و سەرگەردانی كردن.

بەم جۆرە بانگەوازی ئەو پێغەمبەرانەی لە دوای حەزرەتی موساوە(سەلامی خوای لێبێت) هاتوون لەسەر یەك تەرز دەڕوات، پێغەمبەر یوشەع(سەلامی خوای لێبێت) و حەزرەتی داود (سەلامی خوای لێبێت) هەر لەسەر ئەم ڕەوتی جیهادە ڕۆیشتون.

بەڵێ داود پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) سەربازێك بوو لە سوپای(طالوت)دا رووبەرووی (جالوت) بوویەوەو لە مەیدانی جەنگدا كوشتی، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو ئامانجانەدا زۆرێك لە

سەربازەکانی(طالوت) لەڕێگەدا دواکەوتن و کشانەوە: ﴿قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ﴾ البقرة: ٢٤٩. (وتیان:ئێمە ئەمڕۆ چاری جالوت و سوپاکەی ناکەین)تەنها کەمێکی زۆر کەم لە ئیمانداران مانەوە لەگەڵیدا و وتیان: ﴿كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةَۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ البقرة: ٢٤٩. (ئەگەر خودا مەیلی لێ بێ زۆر تاقمی کەم سەردەکەون بەسەر تاقمی زۆردا). بەرەو ڕووی مردن چوون و ژیانی دنیایان بە سوك و بێبایەخ دانا، ئیتر سوپای (جالوت)یان شکاند و لەو بانگەشەی دەیانکرد خوای گەورە بەڕاستی دانان و بە درۆی نەخستنەوە، "عەمالیقەکان"ی لەو شوێنە دەرکرد و ئاواتی بەنی ئیسرائیل هاتەدی کە بریتی بوو لە چوونە ناو "قودسی پیرۆز".

## ب-چەمك و جوگرافیای فەرمانڕەوایی لە زەویدا لە لای ئوممەتی محەممەدﷺ.

با چاوێك بە ژیان و ڕەویەی پێغەمبەرداﷺ بگێڕین دەبینین لە ناخ و ڕۆحی ئەصحابەی کیرامدا نووری ئەم ئامانجە بەرزەی –فەرمانڕەوایی لە زەویدا – داگیرساند، پێشتر چەند نمونەمان هێنایەوە. ئەوەی هەمیشە پێش ئەم ئامانجە دەکەوێت بەڕێوەبردن و دامەزراندنی ژیانی کەسیەتی یە بە پێی ژینگەی ئاینداری، خوای گەورە ئەم سەرکەوتن و سەربەرزیەی بۆ هێنانە دی و دەرگاکانی جیهانی لەبەر دەمدا کردنەوە. لە ڕاستیدا ئەم ئامانج و مەبەستە کاکڵەی ئەو پەیامەیە کە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ هێناویەتی، بێگومان خوای گەورە قورئانی پیرۆزی پێدا

ناردووە تاوەکو بەسەر هەموو ئاینەکانی تردا سەری بخات، هەروەك ئایەتە پیرۆزەکە دەری دەخات: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ ﴾ الفتح: ٢٨ .

خوای گەورە بەڵێنی فەتحی مەککەی پێدا و –بەڵێنی خۆیشی دەباتە سەر– مەککە فەتح کرا، هەروەها لە ئایەتەکە ئەوە دەرك دەکیرێت کە خوای باڵادەست هەر کاتێ وەختی هات هەموو جیهانی بۆ فەتح دەکات. هەروەها ئەمەش لە ناوەرۆکی ئەو بەڵێنەدایە کە خوای پەروەردگار پێی داوە، چونکە جگە لە ئیسلام هیچ دینێك لەسەر زەویدا نامێنێت . ئیسلام ئەو دەستورەیە کە ئارامی و ئاسودەیی و دامەزراوی دەرێژێت بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا.

بەڵێ، خوای میهرەبان ئەم ئاینەی بە پێغەمبەرەکەیدا ﷺ ڕەوانە کردووە کە سەرزەوی بە نووری ئەم ئاینە ڕووناك بێتەوە و وێرانکاریەکانیش بە هیدایەتەکەی ئاوەدان بکاتەوە .

ئەوەی لە ویژدانیدا ئاگری تامەزرۆیی و تاسە و عەشق کڵپە بکات و هەڵگیرسێ، جیهاد دەکاتە مەزنترین ئامانج و مەبەست لە ژیانیدا، بەڵکو مردن لەم ڕێگایەدا بە خەڵاتێکی گەورە دادەنرێت، بێگومان ئەگەر(فەنا) نەبێت(بەقا) نابێت، ئەو ڕێگایەی کە دەتگەیەنێنە (بەقا) بە (فەنا)دا تێدەپەڕێت، ڕۆژیش دوای شەو و بەهاریش دوای زستان دێت، ئەوانەی شەو و زستانیان لەژیاندا نەبێ، نابێ بەتەمای بەهار و ڕۆژ بن.

ئێمه چاوەڕێین له ئوممەتەکەماندا ڕۆژی ڕووناك هەڵبێ.. بەڵێ، دەبێ چەندین شەوی درێژ بەسەر بەرن و چەندین کۆسپ و کاری گران بدەنەبەر و له ڕووبارەکانی خوێن بپەڕنەوە و لەپشت خۆتانەوە چەندین شاخی چەشنی ئوحود جێبهێڵن، پاشان به فەتحی مەککە و سەرکەوتن له (چاڵدێران)دا[1] خۆشحاڵ دەبن. پاشان لە زستانێکی سەختدا دوای شەوێکی تاریك، پاش چوونه ناو هەزارەها دەرد و بیم و نۆشینی ئێش و ڕێش ئەم هەمووە دەمرن. بێگومان هەموو لەدایك بوونێك ئازار و ژانی هەیە، ئەوانەش دەیانەوێت تام و چێژی لەدایك بوون بنۆشن لەسەریان پێویسته به ژان و ئازارەکەی ڕازی بن.

خوای گەورە بەڵێنی سەرکەوتنی ئاینەکەی داوە به هەڵگرانی ئەم ئایینە، چەندە بە ئاینی خواوە پابەند بن هێندەش لەنێو خەڵکیدا باڵادەست دەبن ، بێگومان لە داهاتودا خوا ئاینەکەی سەردەخات، ئەگەر لەم وڵاتەش نەبێ لە جێگە و شوێنێکی تری جیهاندا بەڵێنەکەی جێبەجێ دەکات. چونکه بەڵێنی ئەو گومانی تێدا نیە. ئەمەش بەستراوە بەو هەوڵەی ئەو کۆمەڵە دەیدەن له جیهادکردن و دامەزراوی و پێداگری بۆ پاککردنەوەی زەوی لە فیتنە و ئاشوب. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ﴾ البقرة:

---

١- ئەمە جەنگێك بوو لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و صەفەوییەکانی ئێراندا ڕوویدا، عوسمانیەکان بەهاوکاری کوردەکان سەرکەوتنێکی باشیان تۆمار کرد. "وەرگێڕی کوردی"

١٩٣. واته تێبکۆشن و جەنگ بکەن هەتا لەسەر زەویدا دڵەڕاوکێ و ئاشوب نەمێنێ و، مرۆڤ بگاتە هەرێمێکی ئاسوودە و بەختەوەری دنیا و دوا ڕۆژ، بەو واتایەی کە نابێت واز لە جیهاد بهێنرێت تا ئەو کاتەی ئیسلام هەموو سەرزەوی دادەپۆشێت وگشت مرۆڤایەتی بە ئاسایش و ئاسودەیی دەژین.

پێغەمبەرﷺئەم هەستە نورانیەی لە رۆحی ئەصحابە بەڕێزەکاندا (خوا لە هەموویان رازی بێت) داگیرساند. با چاوێك بگێڕین بەو جوگرافیای زەویە نورانیەدا کە بەو چرا پڕ نووره ڕووناك بوویەوە.هێشتا پێنج ساڵ بەسەر خەلافەتی حەزرەتی عوسماندا(خوا لێی رازی بێت) تێنەپەڕی بوو، زۆربەی سەرزەوی و هەموو ئەفریقا مل کەچ بوون بۆ دەسەلاتی ئیسلام، لەلایەکی ترەوە سوپای موسڵمانان لە دەریای (خەزەر) پەڕینەوە و فەتحی (تەبەرستان)یان کرد و دوای ئەوەش (ماوەرای نەهر) واتە ئیسلام گەیشتە بەربەستی چین، بەو مانایە خوای گەورە دەوڵەتێکی پێبەخشین کە ڕووبەرەکەی پەنجا ئەوەندەی ڕووبەری ئێستای تورکیا دەبوو، چونکە ئەوان بۆ ئەم ژیانەی دنیا پێداگر و سوور نەبوون و لەرووی مردندا پێدەکەنین. هەروەها ئێوەش هەرکات ژیانی دنیاتان بەکەم سەیر کرد و، خۆشی و حەوانەوەی خۆتانتان بەخت کرد و ئاینتان کردە ژینی ژیانتان، هەریەکەشتان وتی: مادەم ئیسلام فەرمانڕوایی هەموو ژیان نەبێت مردن بۆ من باشترە، لەوکاتەدا خوای گەورە (سبحانە و تعالی)

بەخششی خۆی بەسەرتاندا دادەبارێنێت و دەتانكاتە فەرمانڕەوای سەر زەوی، ئەو كۆمەڵەی كە لە پێناو دانانی بەیداخەكەیدا لەسەر لوتكەی قەڵا بەرزەكاندا خەبات دەكات و بڕیاری داوە ئەم كارە بە نیەتێكی پاك و خاوێن بۆ خوا ئەنجام بدات و، فەرمانڕەوایی ئیسلام لەسەر زەویدا بڵاوبكاتەوە، لەداهاتووشدا بەرەو ئاسمان دەكەوێتە رێ بۆ ئەوەی بەیداخی ئیسلام لەوێدا هەڵبكات، بەمەش سۆز و كۆمەكی خوایی بە دەست دێنێت و، خوای گەورە فەرمانڕەوایی جیهانی پێدەسپێرێ.

بەڵێ، فەرمانڕەوایی لە جیهاندا نایەتە دی هەتا ئەم دەروونە ڕەببانیانە خۆیان و بیناكەی كامڵ نەكەن و لەبەرامبەریدا ڕۆحیان پێشكەش نەكەن.

# بەشی چوارەم

# دەستکەوتەکانی جیهاد

## ١- جیهاد ئاسایشی ناوخۆ و دەرەوە دەستەبەر دەکات

هەموو گەل و نەتەوەیەك هێزێکی دیاری کراویان هەیە، ئەگەر ئەو نەتەوەیە هێزو تواناکانی لە بەرامبەر دوژمنی دەرەکیدا بەکار نەهێنێت بۆ گەیشتن بە فەرمانڕەوایەتی زەوی، ئاشوب و پشێوی لە ناوخۆدا بەرپا دەبێت، بگرە ناکۆکی لە نێوان تاکەکانی خۆیاندا دروست دەبێت و ئەمەش دەبێتە هۆی ڕژانی خوێن لە سەر شەقامەکان و دیتنی تابلۆی تەرمەکان لەهەموو گۆشەیەکی ولاتدا. ئیتر لەم ولاتەدا تەنها بێوەژن و جەرگ سوتاو دەبینی کە فرمێسك دەڕێژن بۆ کوڕ و مێردەکانیان. هەتا پشێوی و ئیرهاب بالادەست بێت و دەستی بگاتە شەرەف و ئابڕووەکان هیچ کەسیش لە ژیانی خۆی دلنیا نابێت. بەهەرحال ئەو ئوممەتەی کە لە چارەی نوسراوە لەسەر زەویدا فەرمانڕەوا بێت یان لانی کەم ببێتە ئامرازی هاوسەنگی لەسەر زەویدا، هیچ شوێنێکی بۆ فیتنە و ئاشوبی ناوخۆ نامێنێتەوە، بەجۆرێك تاکەکانی ئەو کۆمەلگەیە ناگەنە چلە

پۆپەی خۆشەویستی بە یەکبوون نەبێت بەرامبەر بە دوژمنی دەرەکی، ئەمە لەو هۆکارانەیە کە ناکۆکیەکانی ناوخۆ دەگەێننە کەمترین ئاست.

پێویستە لێرەدا شتێك وەبیر بێنینەوە ئەویش ئەوەیە: ئامانجی سەرەکیمان فەرمانڕەوایی سەر زەوی نیە تەنها لەبەر خودی فەرمانڕەوایی خۆی، هەروەها هێنانەدی ئاسایش و پیادەکردنی یاسا نیە لە ناوخۆدا، بەڵکو ئەم کارانە بەروبوم و بەرهەمی مەبەستە سەرەکیەکەی ئێمەن، بەڵام مەبەستە سەرەکیەکەمان گەیاندن و بەرز ڕاگرتنی کەلیمەی (اللە)یە لە هەموو سەرزەویدا، بێگومان بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش پێویستە کە وەك ئوممەت بەهێزبین و ئەو بەربەرست و لەمپەرانەی لەڕێگاماندان لایان بەرین. لەڕاستیدا نابێت ئەم دوو شتە تێکەڵ بکەین، ئێمە دەمانەوێت هێز بەدەست بێنین تاکو لە ڕێگەی جێبەجێ کردنی فەرمانی خوادا(سبحانەوتعالی) بەکاری بهێنن ، ئەگەر نا نەشیاو و نەگونجاوە بە خەیاڵی موسڵماندا بێت کە هێز بەدەست بێنێ بۆ سەرکوتکردن و داگیرکاری و فەرمانڕەوایی و زۆر و ستەم.

ئەو ئوممەتەی کە ژێر پێ و زەلیل و ڕیسوا بێت بەهیچ جۆرێك ناتوانێت نوێنەری ئەو حەقیقەتە بەرزانە بێت، ئیتر چۆن دەتوانێت ئەو حەقیقەتانە بەخەڵکانی تر بگەیەنێت؟ کە خۆی بەدەست ڕیسوایی و زەلیلیەوە دەناڵێنێ خەڵکانی تر ئەو ڕاستیانە هەرگیز لە دەستی ئەو وەرناگرن. لەبەر ئەوە پێویستە هێز و توانامان لە هەموو بوارەکانی ژیانماندا لە بەرزترین ئاستدا جێگیر بکەین کە ئوممەت لەسەر پێی

خۆی و بەسەری بەرزەوە ڕادەوەستێنێت، دەبێت سوپامان بە نوێترین چەك پڕ چەك بكرێت و مەڵبەندەكانی پەروەردە و زانست لانكێك بن بۆ داهێنانە نوێ و زانستەكان. پێویستە دەزگای "ئاسایش"مان خاوەنی هێزێكی وەها بێت كە ترس و بیم بخاتە دڵی تیرۆریست و گێرە شێوێنەكانەوە لە جیهاندا، بە جۆرێكی وا كە وڵاتانی تر داوای كۆمەكمان لێ بكەن ، لەوشتانەی كە خۆیان ناتوانن بەسەریدا زاڵ ببن بۆ نەهێشتنی ئاشوب و ئاژاوەی ناو وڵاتەكانیان. دەبێت ئابوریمان بگاتە ئاستێك كە لە زیادەكەی دیاری و بەخشیش بۆ گەلانی تر بنێرین، بەڵێ بۆ ئەوەی شایەن بین بۆ هێنانەدی ئەو حەقیقەتە بەرزانە و ببینە نوێنەریان، پێویستە فەرمانڕەوابین لەسەر زەوی و، ئەمەش مەرجێكی ترە بە جیهاد نەبێت نایەتەدی.

مرۆڤی ئیماندار ناچارە كە لەهەر شوێنێكی جیهاندا ستەمی بەدی كرد تێبكۆشێت بۆ نەهێشتنی، چونكە ئیماندار ڕەگەزی هاوسەنگی یە لە زەویدا، بۆیە سەرەتا لەدەور و بەریەوە دەست پێدەكات، پاشان هەوڵ و تەقەلا دەدات و دەگەڕێت بۆ ئەو هۆكارانەی كە ئەم بازنە فراوان دەكەن، بەهیممەتێكی بەرزی واكە هەموو جیهان لە بەرزی و فراوانیەكەیدا چاوی لێبكەن و، بەرنامە ڕێژی دەكات و ئەو هۆكارانە دەگرێتە بەر كە لە تەك شكۆو گشتگیریەكەیدا گونجاوبن.

گومانی تێدا نیە كە ئیماندار بەرامبەر بە دروستكراوان بە بەزەیی و بەخشندەیە ، هەر ئەوەشە وای لێدەكات كە پەرۆش بێت بۆ ڕزگار

کردنی خەڵکانی تر. لەم پێناوەشدا گوێ نادات بە هەموو ئەو تەنگ و چەڵمە و ئێش و ئازار و سوکایەتیانەی کە دێنە ڕێی، لەهەمان کاتدا لەبەردەم ئاشوب و ئیرهابدا وەك کێو دامەزراوە، جاری واش دەبێت لە پێناو لابردنی ستەم و شوێنەوارەکانیدا خۆی بەخت دەکات. قورئانی پیرۆزیش ئەم سیفەتەی ئیمانداری بەهەند وەرگرتووە:﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ المائدة: ٥٤.(توند و بەدەستەڵاتن لە سەر کافران).

ئیماندار پیر بێت یان گەنج ئەگەر پێویست بوو جیهادی ماددی جێبەجێ دەکات و لە بەرەی ئاسایش و دەستوری وڵاتدا بە خۆی و ماڵ و خێزانیەوە بەڵکو ئەگەر پێویست بوو بە منداڵەکانیەوە دەوەستێت و پارێزگاری لەشەرەف و ئابڕوی دەکات، تا ئەو کاتەی کە هەموو کون و قوژبنێکی وڵات لە تۆڕی فەساد و خراپەکاری پاك دەبێتەوە. لەبەر ئەوەی ئیماندار بەفەراسەت و زیرەکی خۆی لەوە تێدەگات کە ئەگەرکەمترین بوار و مۆڵەت بدرێت بەو تیرۆرەی کە مانای مرۆڤایەتی نازانێت و وەك هەژدیهایەك دەوری جیهانی داوە ، مانای کردنەوەی دەرگایەکە لە دوا ڕۆژدا بۆ چەندین سازش و داواکاری بێ کۆتایی تیرۆرستان.

مرۆڤی تیرۆرست کە ئاوات و داوایەکی –با زۆر بێ ئەرزشیش بێت– دێتە دی ئیتر بەوە دەست بەردار نابێت، بەڵکو هەوڵ دەدات کە ئاوات و داواکانی تری بێنە دی و چاوەڕێی تەنەزولی تر دەکات، ئیتر تەنازول لەدوای تەنازول دێت و بەم شێوەیە، ئەگەر هاتوو ڕۆژێك لە

ڕۆژان شەرەف و ناموس و نیشتمان و هەر هەموو موقەدەساتمانی خستە سەر مێزی گفتوگۆ (موفاوەزات)کە ئەوە لەحەقیقەتدا دەرئەنجامێکی زۆر تاڵی ئەو تەنازولەیە کە یەکەم جار درا، کەواتە پێویستە ئیماندار زۆر ورد و بێدار بێت هەر لە سەرەتاوە هیچ تەنازولێك نەکات و خاوەنی بڕیار و بەڵێنی خۆی بێت.

ئەگەر تیرۆرستەکان داوایان کرد کە سبەینێ دوکان و بازاڕەکان دابخرێن مرۆڤی ئیماندار دوکان و شوێنەکەی خۆی دەکاتەوە و تیایدا چاوەڕێ دەبێت تەنانەت ئەگەر بیانویەکیش هەبێت بۆ داخستنی دوکانەکەی لەو ڕۆژەدا. ئا ئەم کارەی بۆ دەبێتە گەورەترین جیهاد، چونکە بە واتای ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ستەمە، وەك ئەوە وایە کە تفی کردبێتە ناوچاوانی ستەم کار.

ئەمەش لە دیدی ئەودا دەرگایەکە و بۆی کراوەتەوە تاوەکو بە پلەی شەهیدی بگات، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ)[1] (هەرکەس لەسەر ماڵ و سامانەکەی بکوژرێت ئەوە شەهیدە).

ئەگەر ئیرهابیەکی چەکدار هاتە بەردەم ماڵەکەت و داوای شتێکی لێکردیت -با زۆر کەمیش بێت- پێویستە بەرگری بکەیت و ئەو شتەی نەدەیتێ، چونکە ئەگەر داواکاری یەکەمی هاتەدی وادەکات لە کاتێکی تردا بێت و داوای شتی تر بکات، بەم جۆرە وات لێدەکات هیچت

---

١- البخاري، المظالم، ٣٣ .مسلم، الإيمان، ٢٢٦.

بەدەستەوە نەمێنێت، ئالەوکاتەدا زۆر پەشیمان دەبیتەوە چونکە ژیانت پێش خست بەسەر مردنداو یەکەم جار تەنازولت بۆ کرد. تاکە چارەسەر بۆ ئەوەی بەرنەبیتەوە بۆ ئەم زەلیلی و ڕیسوایە لە دەستی خۆتدایە و خۆتیت، چونکە لە سەرت پێویستە ئەو مردنەی کە دەتگەیەنێتە پلەی شەهیدی و بەختەوەری هەمیشەیی پێش بخەیت بەسەر چەند ڕۆژێکی ژیانی دنیادا کە بە سەر شۆڕی و ڕیسوایی بەسەر ببرێت.

بێگومان هەرجۆرێك لە جۆرەکانی ئیرهاب بگریت لەم کاتەدا کانگاکەی دەگەڕێتەوە بۆ بێگانەکان، ئەوان دەیانەوێت ئەم نیشتمانەی کە وەك بەهەشت وایە بیکەنە دۆزەخێك کە هیچ کەس توانای ژیانی نەمێنێت تیایدا. لەوە ساناتر نیە وڵاتێك ناچار بە سەرنەوی کردن بکرێت کە بەهۆی پشێوی و ئیرهابەوە هێز و توانای لەدەست چوو بێت. بێگانەکان نەخشە بۆ ئەمە دەکێشن. ئەوان دەیانەوێت ئەم وڵاتە بکەنە ژێر دەستە و بەو شێوەیەی کە دەیانەوێت بەکاری بهێنن. هەر هەموو ئیرهابی و ئاژاوەچیەکان بەکرێ گیراوی ئەو داگیرکەرانەن. بەڵام -خوا کۆمەك بێت- ناگەنە ئاواتەکەیان و ئەو فڕوفێڵە خراپانە بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە. لێرەدا شتێکی گرنگ دێتە ئاراوە ئەویش ئەوەیە کە ئایا سەرقاڵ بوون بە ئیرهابی و ئاژاوەچیەکانەوە لەو ئامانجەی کە مەبەستمانە دوامان دەخات ، یان ئایا ئەمەش ئەو شتە نیە کە دوژمنەکانمان بە پلەی دووەم دەیانەوێت ؟ چونکە ئەوان لەوە دەترسن

که ڕۆژێك له ڕۆژان موسڵمانان بەهێز بن، ئیتر ئەوکاتە –ئیرهابیەکان– وەك کەرە کێوی لە دەست شێر هەڵدێن.لێرەدا شتێك هەیە پێویستە قەت لەبیر نەکرێت ئەویش ئەوەیە کە: ئەگەر پێویست بوو موسڵمان لەگەڵ هێزی سوپا یان ئاسایشی وڵاتدا بێت بەرامبەر هەر دوژمنکاریەکی دەرەکی یان ناوخۆ، ئەو کاتە لەسەری واجب دەبێ و، ناکرێت واز لەو واجبە بهێنێت. تەنها ئەوەندە بەسە کە دەوڵەت بانگی بکات و ئەو ئەرکەی پێ بسپێرێت، گومانی تێدا نیە کارەکەی ئەم تەواوکەری کاری دەوڵەت دەبێت، بە پێچەوانەی ئەمەوە هەر جموجوڵێکی تاکڕەوی سەردەکێشێت بۆ ئیرهابێکی تر. پێویستە لە سەر باوەڕداران بە وردی لەم کارە بڕوانن چونکە ئیرهاب و ئاژاوەگێڕی هیچ ڕویەکی شەرعیان نیە و پێویستە لە ریشك دەربهێنرێن. جاری وا دەبێت هەندێك وڵات هەڵدەستن بە نانەوەی ئیرهاب و ئاشوب هەروەك ئەمەریکا و ڕوسیا و چین وا دەکەن... لەوکاتەدا ئەرك و فەرمانی سەرشانی ئیماندار ئەوەیە کە ئەو پەڕی هێز و تواناکانی بەکار بێنێت و لەبەردەم ئەو پشێوی و ئیرهابە دروست کراوەدا بوەستێتەوە، کاتێکیش کار گەیشتە ئەمە، کەواتە دەوڵەت لەژێر ڕەحمەتی دوژمناندا دەبێت، ئەوکاتە فەرزێك دەکەوێتە سەر شانی هەموو تاکێك لە کۆمەڵدا. واتە لەوکاتەدا ئوممەت ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ دەکات و ئەم پاڵەوانیەتیەش دەخرێتە سەر پاڵەوانیەکانی تری لە مێژوودا، لە خوای گەورە داواکارین کە نیشتمان و ماڵەکانمان لەم هەڵوێستە بەدوور

بگرێت. بەڵام ئەگەر خوای گەورە ئەمەی لە چارەنوسین ئیتر هیچ چارێکی ترمان نیە ئەم کارە نەبێت. هەمیشە ئیماندار مردنی سەربەرزی لەلا خۆشەویستترە لە ژیانی ریسوایی و سەرشۆڕی –مردن نایترسێنێت– پێویستە هێزە دەرەکیەکان و ئەو وڵاتانەی کە یارمەتیدەری ئیرهابن و ئاژاوە دەنێنەوە ئەمە باش بزانن. خۆ بواردن و ڕاکردن لە جیهاد و، دەست بەرداربوون لە وڵات و شار لە ژێر بەزەیی دوژمناندا ، لەگەڵ ئەوەی نزمی و سوکیە ئیماندار لێی بە پەرێزە سیفەتێکی نەخوازراویشە و هەرگیز بەخەیاڵی ئیمانداردا نایەت، قورئانی پیرۆزیش ڕێگەی سەربەرزی فێری ئیماندار دەکات لە کاتێکدا کە لاواز و هەژارەکان لە پیاوان و ژنان لەژێر ستەم و ئازاردان و جگە لە دوعا هیچ ڕێگە چارەیەکیان نیە. ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾﴾ النساء: ٧٥. ئای چۆن نزایەکە؟!! دوعایە بۆ ئەوەی دەرچن لە جێگە و ماڵ و حاڵی خۆیان، چونکە موسڵمانان لەم جێگەیەدا لاواز بوون و بوونەتە ژێر دەستە، هێزی حەق پساوە، هەرچەندە زێد زێدی خۆیانە و هی کەسی تر نیە، هەرچی ماڵ وحاڵیشە هی خۆیانە، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەیانەوێ لێی دەرچن، بۆ ئەوەی دووچاری ئەو زەلیلی و ڕیسوایی و سەر شۆڕی و ملکەچیە نەبن، چونکە لە سادەترین مافەکانی مرۆڤ بێبەش دەبن، ئەو مرۆڤانەی کە هەموو ماڵ و سامانیان

لێ زەوت كرا، ئەوانەی كە موقەددەسات و ئازادیان ژێر پێ خرا، بە جۆرێك كە دیمەنەكە ئەم بارە نالەبارە ئازاریەخشەمان پیشان دەدات، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾ النساء:٧٥. (ئەوە چیتان لێ قەوماوە ؟ بۆ دانیشتون؟ بۆچی لەپێناوی رەزامەندی خوادا ناجەنگن؟) بەجۆرێ ئایەتەكە بە بێداركردنەوە و لۆمە یەك لەدوای یەكەكانی ئیماندارى گوێگر بەتوندی دێنێتە شۆكە و رایدەچڵەكێنێت.

ئێمە نەمانتوانیوە مافی حەق و راستی وەك پێویست بدەین، هەروەها نەمانتوانیوە بچین بەدەم داواكاریەكەی قورئانی پیرۆزەوە، نەشمانتوانیوە هەموو تواناكانمان بۆ بەرزكردنەوەی بەیداخەكەی لە گشت گۆشەكانی جیهاندا بەكاربێنین ، بۆیە پارچە پارچە بووین و بەم لاولادا بەش بەش بووین. لەبەر ئەوەی بارودۆخمان بەو جۆرە ئازاراویە، دوژمنانیش هێرش دێنن بۆمان، ئێمەش بێباكانە سەیریان دەكەین كە چۆن پارچە پارچەمان دەكەن و یەك لەدوای یەك هەڵمان دەلوشن. بەداخەوە دەڵێین هەموو جیهانی ئیسلامی لەم بارە ریسواكەر و نزمەدا دەتلێتەوە، هەروەك هیچ رێگاچارەیەك نەمابێت و بە تەواوی لەدەست چووبێت، خۆمان بە تەنها و بەبێ دۆزینەوەی رێگاچارە بۆ گرفتەكانمان دۆش دادەمێنین، نەخێر...هەزار جار نەخێر.. ئەگەر ئیماندار هەر چوار لای –راست و چەپ و بەردەم و پشتەوەی– بە تاریكی دەورە بدرێت، لەسەری پێویستە نورێك پەیدا بكات بۆ رۆشن كردنەوەی لاكانی.

هەروەها لەسەری پێوستە کە متمانەی بەخوا زیاد بکات و پەیوەندی بە ڕەسول الله وەﷺ بکات، ئیتر ئەوەندە نوور و ڕوناکی دەست دەکەوێت کە هەموو جیهان ڕوناك دەکاتەوە، پاشان ڕا دەکات بۆ جیهانە تایبەتیەکەی خۆی و ئەویش ڕوناك دەکاتەوە.ئیماندار بێلە جیهاد و هەوڵی خۆی و ئەوەی کە خۆی بەختی دەکات نابێ بەتەمای هیچی تر بێت، ئەو هەموو شتێکی بە رەنج و ئارەقی ناوچەوان و ئێش‌وئازار و ماندوبونەکانی دەست دەکەوێت، پاشان کێشەکەی دەباتەوە و لە ئەنجامدا دەتوانێ خۆی و گشت مرۆڤایەتیش ڕزگار بکات.ئیتر کێشە و ناجێگریەکان لە گەندەڵی ناوخۆوە سەرچاوەیان گرتبێت، یان لەو کێشە و نەهامەتیانەی کە لە ئیرهاب و ئاشوبەوە پەیدا دەبن یان لەو تەنگەتاوکردن و دڵەڕاوکێیەی بەهۆی دەستدرێژیەکانی دەرەوە دروستی دەکەن، یاخود بەهۆی هەر ئێش و ئازارێکەوە توشی موسڵمانان دەبێت هیچ جیاوازیەکی نی یە... ئەم بەڵاو کارەساتانە و چەندین شتی تریش، تەنها بە جیهادی مادی و مەعنەوی چارەسەر دەبن.بە کورتی و پوختی جیهاد : زامنی جێگیربوون و ئارامی ناوخۆ و دەرەوەیە، ئەو دنیایەی کە جیهادی تێدا نیە، دڵنیایی و ئارامی تێدا مسۆگەر نیە.

## ٢- جیهاد رێ لە سەرشۆڕی و ڕیسوایی دەگرێت

ئیماندار بەو جیهادە ناوخۆیی و دەرەکیەی ئەنجامی دەدات سەربەرز دەبێت، هەرکاتێك وازی لەو ئەرکە هێنا کە لە سەریەتی و چێژ

و ئارەزووەكانی ژیان سەرقاڵیان كرد و ئاوات و ئامـانجی لـە چێژەكانیدا قەتیس كرد، ئەوكات سەربەرزی و هەیبەتی لەدەست دەدات و ڕیسـواو سەر شۆڕ دەبێت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (...وَتَركتُمُ الجِهَادَ سَلَط اللهُ علَيكُم ذُلاً لاَ ينزعه حتى ترجعوا إلى دينكُم)[1].

. ئەمەش ئەوە دەگەیێنیّ كە ژیانی سەربەرزی بەوە دێتەدی كە شان بدرێتــە بــەر هەنــدیّ لــە دژواری و زەحمەتــەكان بــەناوی جیهــادەوە. ئوممەتیش كاتێك لەبەردەم ئەو نەهامەتیانەی خۆڕاگر دەبێت ئـەو كـات شایەنی ئەم ژیانە سەربەرزە دەبێت. ئەگەر هەموو كەس واز لـە جیهـاد بهێنێت و نوقمی ئارەزووە كەسیەكانی ببێت لەو كاتـەدا تۆڵـەی خـوایی گشتی دادەبارێت بەسەر ئوممەتدا و، ستەمكار و سـتەملێكراو، تاوانبـار و بیّ تاوان بەردەكەوێت. هەر لەبەر ئەمەیە پێویسـتە هـەموو ئوممـەت بەگشتی دەست بگرێت بە جیهادەوە تاوەكو ڕیّ بگرێت لە داباڕینی بەڵا بە سەریدا.

لێرەدا دەمەویّ فەرمودەیەكی پیرۆزی سەرداری هەردوو جیهانﷺ ڕوون بكەمەوە: (إذَا تَبَايَعتُم بالعِينَةِ وَأخذتُمْ أذْنَابَ البَقَرِ وَرَضِيتُمْ بـالزَرعِ وَتَركتُمُ الجِهَادَ سَلَط اللهُ علَيكُم ذُلاً لاَ ينزعـه حتـى ترجعـوا إلى ديـنكُم)[2].

(ئەگەر كڕین و فرۆشتان بە "سوو" بوو و دەستانكردە ئاژەڵـداری و بـە

---

١- أبوداود، البيوع، ٥٤. المسند للإمام أحمد ٤٢/٢.

٢- أبوداود، البيوع، ٥٤. المسند للإمام أحمد ٤٢/٢.

کشتوکاڵ رازی بوون و وازتان لە جیهاد هێنا، خوای باڵادەست ریسواییەکتان بەسەرادێنێ لای نابات هەتا نەگەڕێنەوە بۆ دینەکەتان).

بێگومان(العینة) بەکڕین و فرۆشتن ڕاڤە کراوە ئەویش بە دوو جۆر: یەکەمیان کڕینی کەل و پەلێك بە قەرز، دوای ئەوە فرۆشتنی خودی ئەو کەل و پەلە بە خاوەن قەرزەکە بە نرخێکی هەرزانتر بەڵام بە پارەی حازر(نقد)، مەبەست لەم کڕین و فرۆشتنە ئەوەیە، ئەوکەسە پێویستی بە پارەیە، بەڵام وەرگرتنی پارە و دوایی زیادە خستنە سەری ئەبێتە سوو(ربا) ئیدی پەنا دەباتە بەر(عەینە) ئەو شێوازەی مامەڵە بۆ ئەوەی نەبێتە سویەکی ئاشکرا، دەکرێ بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە، یەکێك پێویستی بە هەشت سەد هەزار دینارە، شتێك لە کەسێك دەکڕێت بە ملیۆنێك بەقەرز پاشان هەمان شت دەفرۆشێتەوە بە هەمان کەس بە هەشت سەد هەزار دینار ، بەڵام بە پارەی حازر. لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێ کڕین و فرۆشتنی کردبێ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچ جیاوازیەکی نیە لە سوو(ربا) وە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە.

بەڵام ئەو ڕاڤەیەی کە رای زۆربەی زانا و شەرع ناسەکانی لەسەرە بۆ(العینة) ئەم ڕاڤەی دووەمەیە: عینە: بریتی یە لە جێبەجێ کردنی کڕین و فرۆشتنێك کە لە داهاتوودا ئەنجام بدرێت، وەك: ئەوەی قەرزی لایە دێت بۆ لای خاوەن ماڵ پێی دەڵێت ئەم مانگە (کە بڕیارە قەرزەکەی تێدا بدەمەوە) ناتوانم قەرزەکە بدەمەوە. ئەویش ماوەکەی

بـۆ درێـژ دەکاتــەوەو ڕاســتەوخۆ جیــاوازی ئەوکاتــە دەخاتــە ســەر قەرزەکەی (واتە دەبێ زیاتری بداتەوە لە پارەکەی یەکەمجاری خۆی)

پێغەمبـەرﷺ لـەم فەرمودەیـەدا بـە هـەردوو ڕاڤەکەیـەوە ئامـاژە دەکات بۆ بەکارهێنانە خراپەکان لە کاروباری بازرگانیـدا ، دەفـەرموێت هەرکات ئەم خراپ بەکارهێنانە زاڵ بـوو بـە سـەرتاندا ئـیتر چاوەڕوانی ڕیسوایی و سەر شۆڕی بکەن.

بەڵام بەشی دووەمـی فـەرمودە پیرۆزەکـە: (وَأَخـذتُمْ أَذْنَـابَ البَقَـرِ وَرَضِيتُمْ بِالزَرعِ) گومانی تێدا نیە کە ئەم ڕەخنەیە ناڕاسـتەی کشـتوکاڵ نەکراوە، چونکە پێغەمبەرﷺ لـە فەرمودەیـەکی تـردا دەفـەرموێت: (إِنْ قَامَتِ السّاعَةُ وَبِيَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ فَإِنِ اسـتَطَاعَ أَنْ لا يَقُـومَ حَتّـى يَغرِسَـهَا فَليَفعَلْ) (ئەگەر قیامەت بەرپا بوو وکەسێکتان شـەتڵێکی بـە دەسـتەوە بـوو ئەگـەر تـوانی هەڵنەسـێت تـا بیچـێنێت بـا وا بکـات). هـەروەها فەرمویەتی: (مَنْ أحيَا أرضاً مَيتَةً فَهِيَ لَـهُ)[1] ، (ئـەوەی زەویـەکی مـردوو زیندوو بکاتەوە دەبێتە هی ئەو) . بەو مانایەی کە ئیسلام ئارام ناگرێـت لەسەر زەوی مردوو، بەڵکو پێویستە بەکار بهێنرێت و زیندوو بکرێتەوە. واتە فەرمودە پیرۆزەکە ئاماژە بۆ نەبوونی هاوسەنگی دەکـات. چـونکە شادەماری ژیانی ئابووری بریتـی یـە لـە بەرهـەم هێنـان، ئەگـەر هـاتوو بەرهــەم هێنــان تــەنها لــە کشــتوکاڵدا قــەتیس بکرێـت و بازرگـانی و پیشەســازی پشــت گــوێ بخرێــت، ئەمــە مانــای دروســت بــوونی نــا

---

١- المسند للإمام أحمد،١٥. أبوداود، الإارة ٣.

هاوسەنگیە لە بەرهەمهێناندا. بێگومان وێنا کردنی بەدەست هێنانی پێشکەوتن تەنها لە رێی بازرگانی یان پیشەسازیەوە، هەمان واتای نا هاوسەنگی دەگەیەنێت. بۆیە پێویستە هەر مەیدانێك بەپێی خۆی گرنگی پێ بدرێت، بەم جۆرە هاوسەنگی لە بەرهەمهێناندا دروست دەبێت.

بێگومان کشتوکاڵ لە گوندەکاندا بەرهەم دێت ئەگەر گوندنشینەکان هەر هەموو روو لە کشتوکاڵ بکەن، ئەوا شاریش لە فراونبوون دەوەستێ و گەشە ناکات بێگومان ئەمەش دەبێتە هۆی مردنی بازرگانی و پیشەسازی. پێچەوانەی ئەمەش خزانی خەڵکی لادێکان -بەوازهێنانیان لەکێڵگەکانیان- و ڕووکردنیان لە شارە گەورەکان کەم وکورتیەکی تر دروست دەکات. ئەوەی لەم کاتەی ئێستادا دەیبینین لە فراوانبونی شارە گەورەکان بەخێرایەکی زۆر و دروست بوونی گیروگرفت لەگەڵ ئەو خێراییەدا و نەبوونی خزمەت گوزاریەکانی ژێر زەوی و سەر زەوی و بڵاوبونەوەی بێکاری بۆ بەرزترین ئاست... گشت ئەمانە تەنها چەند نیشانەیەکی ئەو ناهاوسەنگیەن.

چونکە ئەگەر هەستانەوە و پێشکەوتن ناهاوسەنگبوون و بەشێك لە ژیانی ئابوریمان پەیوەست بوو بە دەرەوەی وڵاتەوە، هەمیشە لە ژێر ڕەحمەتی دوژمنەکانماندا دەبین و ناتوانین خۆمان لە دەستیان دەرباز بکەین، لەبەر ئەوەی دامەزراوە پیشەسازیەکانمان و، کەل و پەل و کاڵاکانمان و، بەرهەمە کشتوکاڵیەکانمان بە دەرەوە

پەیوەستن... ئەمانە هەمووی ئامرازی هەڕەشەن بۆ سەر ژیانی ئابووریمان. بەو واتایەی کە پێویستە هاوسەنگیەك دروست بکەین لەهەموو بوارەکاندا.

لەبەر ئەوەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ گیروگرفتی کۆچکردن بۆ شارەکان وا خێرا نەبووە ، بۆیە فەرمودەکە تەنها لە چوارچێوەی کشتوکاڵدا ئاماژە بۆ نا هاوسەنگی ئابوری دەکات ، بەڵام لە کاتی ئێستادا ئەو کۆچە زۆرو خێرایەی بۆ شارەکان ئەنجام دەدرێت چەندین گیروگرفت و نالەباریی نوێی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، لەبەر ئەوە چەمکی گەڕانەوە بۆ گوندەکان و نیشتەجێ بوون تیایاندا، یەکێکە لەو چارەسەرانەی کە خۆی دەسەپێنێت و ئەوەش مەبەستی فەرمودە پیرۆزەکەیە.

لەلایەکی ترەوە فەرمودەکە ئەوەی تیایە کە ڕەخنە دەگرێت لە گەڕانەوە بۆ دەوارنشینی و پێداگری لەوە دەکات کە دوای بە شارستانی بوون بە دەوارنشین بمێنینەوە، هەموو ئەمانە کۆمەڵگە توشی ڕیسوایی و سەرشۆڕی دەکەن.

چەمکی سێیەم لە فەرمودەکە ئەوەیە: (وتركتم الجهاد) واتە کاتێك لە کاروبارە تایبەتیەکانتاندا نوقم دەبن و بە یەکجاری پاڵ دەدەنەوە، سەرشۆڕی و ڕیسوایی چاوەڕێتان دەکات، واتە هەروەك چۆن ئەگەر کەشوهەوای مادیتان ڕەش و تاریك بوو، کەشوهەوای مەعنەویشتان ڕەش و تاریك دەبێت، ئەوکاتە ئەستێرەکانی ئاسمانی

ڕۆحتان هەڵدەوەرن‌و، مانگ و خۆریشتان دەگیرێت. واتە: شەریعەت و یاسای فیترەت ڕێگەی ژیان و بژێویتان نادەن لەسەر ڕووی زەویدا.خوای پەروەردگار– پاك و بێگەردی بۆ خوا– ئەو ڕیسوایی و سەر شۆڕیەتان لەسەر هەڵناگرێت هەتا نەگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەتان، هەرچەندە هەوڵ بدەن و تێ بکۆشن بۆ لادانی ، با بشپارێنەوە و نزاش بکەن.

باشە گەڕانەوە بۆ لای ئاین بۆ وەها کەسانێك ئەبێت چۆن بێت؟

لەم کاتەی ئێستادا چەندین مافی بێ شومار و گەورەمان لە ئەستۆدایە، کە لە مێژەوە لە سەریەك کەڵەکە بوون، ئێمە لەم سەردەمەدا مافی سەرشانی خۆمانمان جێبەجێ نەکردووە، ئیتر مەپرسە بۆ مافەکانی تر. لەم کاتەدا ئەوەی کە خێزان و ئوممەت و نەوەکانمان چاوەڕێ دەکەن بۆیان بێنینە دی نەهاتوونەتە دی. لەسەر پشتی لاوازمان چەندەها تاوانی فرەو زۆرگەورە کۆبونەتەوە. موسڵمانی هەستیار لەم سەدەی بیستەمەدا لە ژێر ئەم تاوان و گوناهانەدا پلیشاوەتەوە. بەڵێ ئەم مەسەلەیە وا ئاسان نیە، بەڵکو زۆر جددی وگرانە ، زایەڵە و دەنگی ڕووخاندن و داڕمانی سێ سەدە دێتەگوێمان ، ئەم دەنگ و زایەڵەیە بە ئازارەکانی تەنها چارەکە سەدەیەك دانامرکێتەوە، گومانی تێدا نیە ئێمەین بەرپرسین لەم بارودۆخە، کەواتە ڕزگاربوون تەنها بە خۆمان دەبێت، لەمەودوا زۆر لە خۆمان دەکەین و چراکانمان بە دەستی خۆمان دادەگیرسێنین و ڕوودەکەینە عینایەت و

کۆمەکی خودا، ئەم ڕووکردنەمان بە کردار و گوفتار دەهێنینەدی، بە گوێرەی هەڵسانمان بەم کارە، دەرگاکانی ڕەحمەتی خوامان بۆ دەکرێنەوە، ئیتر بە ویستی خوای گەورە دەستی میهری خواوەند لەو بارو دۆخە پڕ ئێش و ژانە دەرمان دەهێنێ و دەگەینە کەناری ئارامی.

## أ- ئەو کەسانەی کۆسپەکانیان تێ پەڕاند ..

پێغەمبەرﷺ بەو پێڕە هاوەڵەی لەگەڵیدا بوون، لەگەڵ هەموو جیهاندا جیهادی دەکرد، هەموو تاکێك لەو کۆمەڵە چاك دەیزانی لەهەر لاپەڕەیەك لە لاپەڕەکانی ژیاندا چ ئەرکێکی دەکەوێتە ئەستۆ ، بۆ نمونە جەنگی(ئوحود) دیمەنی جیهاد و تێکۆشانی لێ دەدرەوشایەوە، بێگومان هەمووان بە پیاو و ژن و گەورە و منداڵ و پیر و گەنجەوە دەیانزانی چ ئەرکێکیان لە سەرشانە ، هەموو بە دڵسۆزی و خۆنەویستی پێی هەستان تا بارودۆخەکە بۆ بەرژەوەندی موسڵمانەکان گۆڕا.

ئەنەس(خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: دوو کەس هەن قەت لەبەر چاوم بزر نابن: یەکەم دایکم(ئوم سولەیم) و ئەوی تر دایکمان حەزرەتی عائیشە، بە پەلە دەچوون بۆ مەدینە ئاویان دەهێنا بۆ سوپاکە و تێر ئاویان دەکردن، لە پاشاندا دەستیان دەکرد بە تیمارکردنی بریندارەکان.. ئا بەم شێوەیە بە درێژایی ئەو ڕۆژە خەریکی کار بوون. ئا لەم کاتەدا پیرەژنێك هات، دەگونجێ بوترێت ئەم پیرە ژنە پەك کەوتە توانای هیچ کارێکی نیە، هات و دەستی منداڵەکەی

گرتبوو هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئەو نەیدەتوانی وەك ئافرەتـانی دی تیمـاری برینـدارەکان بکـات و، کارەکـانی تـری جـەنگی نـەدەتوانی، هەرچـەندە تـەواو هەسـتی دەکـرد بـەو ئەرکـەی لـە ئەسـتۆیایە ئـەو دەیویسـت لـە(ئوحـود)دا ئەوەنـدەی لـە توانادایـە بـە چـاکترین شـێوە بەشداری بکات.

ئەم دیمەنە قەشەنگە چەندە جێی تێڕامانـە: ڕووی ئـەم منـاڵ و پیرەژنە و حەز و تاسەیان بۆ خزمـەتی حـەق، ئـەو شمشـێرەی کـە لـە شانی منداڵەکەیدایە و خەریکە لـەزەوی دەدات، لاشـەی ئـەم بچـکۆلەیە خەریکـە شمشـێرەکە نـەتوانێ، بـەلام ڕۆحـی خەریکـە لـە بەرزیـدا بەربەرکانێ لەگەڵ ئاسماندا بکـات، پیرەژنەکـە وتـی: هـیچ شـتێکم نیـە پێشکەشی بکـەم و هـیچ کارێـك نـاتوانم، بـەلام ئـەو کـوڕەت پێشـکەش دەکەم، تاوەکو بەرگریتان لێ بکات، پێغەمبەرﷺ سـەیرێکی منالەکـەی کرد کـە چـاوەڕێی وەلام بـوو چـاوەکانی لـە خۆشـیدا دەبریسـکانەوە، هەروەك بڵـێی بـە ڕوانینـە سـەرنج ڕاکێشـەکانی دەیگـوت: یـا ڕەسـول اللهﷺ ڕێگەم بدە با ڕۆحم بکەمە فیدات، ئەوەی ئـەم داوایـە لـە کرۆکـی دڵیەوە دەردەچێ ناگونجێ دەست بە ڕوویەوە بنرێت، هەر لەبـەر ئەمـە بـوو پێغەمبـەرﷺ داواکـەی قبـوڵ کـرد و خسـتیە ڕیـزی سـوپای موسڵمانەکانەوە، منالەکە شمشێرەکەی هەڵگرت کە لـە خـۆی درێـژ تـر بوو هێرشی بردە سەر ڕیزەکانی دوژمن، هەروەك بڵێـی: دەسـت بـەجێ گەورە بوو، بـوە گـەنجێکی لێهـاتوو، بـەلام (ئوحـود) زۆر لـەوە قـورس

تربوو، تەنها نمونەی حەمزە و عبداللەی کوڕی جەحش و موصعەب و.... تاد بەرگەی ئەو حاڵتەیان دەگرت. هەرچەندە ئەم منالە هەندێ لەم ئەرکە قورس و گرانەی خستە سەرشانی خۆی، بەلام ئەم جەستە لاوازەی توانای وەها کۆڵێکی قورس و گرانی نەبوو، بە لێدانی دوژمن کەوتە سەر زەوی -دوای کەمێك لەگەڵ فریشتەکاندا پێشبڕکێ دەکات بۆ لای خودا- ئەم منالەیان گرتە باوەش و بردیانە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزﷺ، دڵی هەروەك دڵی باڵندە لێی دەدا، ڕووی جوانی بە زەردەخەنە دەدرەوشایەوە و چاوەکانی خۆشی و شادیان دەپرژان، چونکە خۆی خستوەتە باوەشی شەهیدی و دەیەوێت مەیدانی(ئوحود) بەجێ بێلێ -وەك ئاگر کلپەی سەندبوو- بەرە و لوتکە و بەرزاییەکانی بەهەشت. پێغەمبەرﷺ نیگای پیرۆزی بڕیە چاوی منالەکە کە بە خۆشی و شادی دەدرەوشانەوە: ئایا هەست بە ئازار دەکەیت؟ منالەکە ئەترسێ کە پێغەمبەرﷺ ئازاری پێبگات دەڵێت: نا ئەی پێغەمبەری خواﷺ. هەروەك بلێی ئەو "خۆرە" خەمبارەی کە خەریك بوو لەسەر(ئوحود) ئاوا ببێ، دەیەوێ جارێکی تر لە ڕووی ئەم منالەدا هەڵبێت.[1]

سەعیدی کوڕی ئەبی زەیدی ئەنصاری (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە: دایکی سەعدی کچی سەعدی کوڕی ڕەبیع دەیوت چومە

---

١- أنظر إلى: المصنف لابن أبي شيبة ٧/٣٧٠- ٣٧١، يوسف الكاندهلوي، حياة الصحابة للكاندهلوي ١/٥٩٨ - ٥٩٩.

لای ئوم عەممارە(نوسەیبەی کچی کەعبی مازنی) پێمگوت باسی خۆتم بۆ بکە: وتی: لەسەرەتای ڕۆژدا سەیرم کرد بزانم خەڵکی چی دەکەن و جەنگ بە کوێ دەگات، دەفرێکم پێ بوو ئاوی خواردنەوەی تێدابوو تا گەیشتمە لای پێغەمبەرﷺ لەناو ئەصحابەکاندا لە مەیدانی جەنگدا بوو، کاتێك موسڵمانەکان لە مەیدانی جەنگدا شکان، چوومە خزمەت پێغەمبەرﷺ وەستام و دەستم بە جەنگ کرد و بە شمشێر دوژمنانم لێ دوور دەخستەوە و بە کەوان تیرم دەهاویشت تا بریندار بووم، دایکی سەعد وتی: لەسەر شانی برینێکی قووڵم بینی پێموت: ئەمە کێ برینداری کردیت؟ وتی: "ئیبن قەمئە" خوا لەناوی ببات، کاتێك کە خەڵك ڕای کرد، ئەو هات و هاواری کرد محەممەدم پیشان بدەن، تیاچم ئەگەر لە ناوی نەبەم، من و موصعەبی کوڕی عومەیر و چەند کەسێك کە لەگەڵ پێغەمبەرﷺ مابوینەوە ڕێمان لێگرت، ئەویش بەم لێدانە لێی دام منیش چەند جارێك لێمدا بەڵام دوژمنی خوا دوو زرێی پۆشی بوو کاری لێ نەدەکرد.[1]

جەنگ هەتا ئێوارە بەردەوام بوو، زۆر پێویست بوو کە لە ناوخۆدا پارێزگاری مەدینەش بکرێت، صەفیەی پوری گەورەی پێغەمبەرﷺ کاتێك بیستی پێغەمبەرﷺ بریندار بووە خۆی گەیاندە ئوحود، ئەویش وەك ئوم عەممارە دوای ئەوەی ڕمێکی لە زەویەکە هەڵگرت و خۆی خستە ناو مەیدانی جەنگەوە و ڕیزەکانی دوژمنی بڕی، پێغەمبەرﷺ

---

١- السيرة النبوية لابن هشام ٨٦/٣- ٨٧، البداية والنهاية لابن كثير ٣٥/٤.

توانای بینینی ئەم هەڵویستەی نەبوو، دەست بەجیٚ بە کوڕەکەی وت: (إنطلق إلى أمك.. فهي أمرأة) واتە: (بڕۆ بۆلای دایکت... ئەو ئافرەتە) لە ترسی دایکی چونکە ڕوبەڕوی کافرەکان دەبویەوە و وای لیٚ دەکردن کە هەڵبیٚن...[1] واتە: لە کاتی تەنگەتاویدا ئافرەت بە واجبی خۆی هەڵدەستیٚت.

بەڵیٚ ئیماندار لەبەر دەم هەموو پیٚشهات و بەلاَو نەهامەتیە ناوخۆیی و دەرەکیەکاندا بەرەو جیهاد دەچیٚ، بەرامبەر بە خیٚزان و ئاین و نیشتمان و ئوممەتەکەی ئەرکی خۆی ئەنجام دەدات. پیٚویستە بە ژن و منداڵ و پیاو و لاو و پیرەوە جیهاد بکەین ، نابیٚت هەوڵ و جیهاد لە لاپەڕەیەکی دیاری کراوی ژیاندا کورت بکریٚتەوە، بەڵکو دەبیٚت هەموو لایەنەکانی ژیان بە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگەوە بگریٚتەوە . ئەگەر وا نەکەین بیٚ گومان دۆڕان چاوەڕیٚمانە. هەروەك ئیماندار هەموو ژیان دەگریٚتە باوەش، جیهادیش واتایەکی گشت گیرە بۆ ژیان و هەموو بوارەکانی ژیان لە خۆ دەگریٚت.

## ب- لە پیٚناو ژیانیٚکی ئازاددا:.

بیٚگومان ڕیٚگەی ژیانی سەربەرزی بە ناسینی ئەو شتە دەست پیٚ دەکات کە شایانی ئەوەیە لە پیٚناویدا بمریت. بەڵیٚ، مردن لە پیٚناوی ئەوەی کە شایەنی مردنە، ئەگەر مردنمان لەلا سانا بوو لە ڕیٚگەی ئەو شتە پیرۆزانەی کە لیٚیان بەرپرسین پیٚویستە لە سەرمان پاریٚزگاریان لیٚ

---

١- حياة الصحابة للكاندهلوي ٨٨/٢، الإصابة لابن حجر ٣٤٩/٤.

بکەین، یان ئەگەر لەو پێناوەدا خۆمان ئامادەی مردن کرد ئەو کاتە هەر لەم ژیانەی دنیاماندا تامی ژیانی هەمیشەیی دەچێژین، زیاد لەوەش ئەوەی کە لە پاشە ڕۆژدا بۆمان ئامادە کراوە کە نە چاو بینیویەتی و نەگوێ بیستویەتی و نە بە دڵی هیچ کەسدا هاتووە، پێغەمبەرﷺ لەم فەرمودە پیرۆزەدا کڵپە دەخاتە ئەو عەشقەی کە بۆ جیهاد هەمانە و ورەو نەترەمان بەهێز دەکات بە:

(لَولا أنْ أشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأحْبَبْتُ أنْ لا أتَخَلَّفَ خَلْفَ سَرِيَّةٍ)، (لَوَدِدْتُ أنّي أغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ فَأَقْتَلُ ثُمَّ أغْزُو فَأَقْتَلُ ثُمَّ أغْزُو فَأَقْتَلُ).[1]

ئای چەندە پلەو پایەیەکی گەورەیە چەندە شەرەفێکی بەرزو شکۆیە، مردن لە پێناوی خوادا و جیهاد لە ڕێی ئەودا، چەندە ئەرکێکی پیرۆز و شکۆدارە تا ئەو ڕادەیەی کە سەرداری پێغەمبەرانﷺ و سەرکردەی هەردوو جیهان و پێشەوای مرۆڤ و پەری کە لە چڵەپۆپەی کەماڵدایە هیوا و ئاواتی بۆ دەخوازێت... کە لەگەڵ هەموو سریەیەکدا دەردەچێت لە پێناو خوادا ، سەرەڕای ئەرکی پەیامە گەورەکەی کە جێبەجێی دەکات، بەئاواتە لەم ڕێیەدا بکوژرێت و پاشان زیندو بکرێتەوە و پاشان بکوژرێتەوە و پاشان زیندو بکرێتەوە و پاشان بکوژرێت و پاشان زیندو بکرێتەوە..، کەواتە ئەو ژیانەی جیهادی تێدا نیە چەندە بێ هودەیە!، جیهاد ئەم پلە و پایەگەورەی تێدایە، کە هەموو خاوەن ژیریەك ئاواتی بۆ دەخوازێتو پێداگری لەسەر دەکات.

---

١- مسلم، الإمارة، ٢٨. البخاري، الإيمان، ٢٦. النسائي، الجهاد، ٣.

لەڕاستی دا ئەو فەرمودانەی لەبارەی جیهادەوە هاتوون سەرنج ڕاکێشن هەندێك لەوانە باس دەکەین: لە ئەبوهورەیرەوە(خوای لێی ڕازی بێت): پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ وَلَمْ يُحَدِّثْ بِهِ نَفْسَهُ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ)[1]، (هەرکەس مردو غەزای نەکردو لە دڵی خۆیدا ئامادەکاریەکی بۆ نەکردبوو کە ڕۆژێك بەشداری بکات، ئەوا لەسەر بەشێك لەدوو ڕوویی"نفاق" مردووە) واتە ئەم مرۆڤە ڕۆحی لە ناوەندی نیفاقدا دەسپێرێ.

لە ڕیوایەتێکی تردا (مَنْ لَقِيَ اللهَ بِغَيْرِ أَثَرٍ مِنْ جِهَادٍ لَقِيَ اللهَ وَفِيهِ ثُلْمَةٌ)[2]، (ئەوەی مردو هیچ شوێنەوارێکی جیهادی پێوە نەبوو بە شەرمەزاری بە حزوری خوای باڵادەست دەگاتەوە). واتە ئەم جۆرە کەسە دێت بۆ مەحکەمەی گەورە، دەم و چاوی سوور هەڵگەڕاوە، چونکە هەست بە ناتەواوی و شەرمەزاری و سەرشۆڕی دەکات.

لەدەوروبەر و ڕاست و چەپماندا ستەم لێکراوی زۆر هەن کە دەست درێژییان دەکرێتەسەر و پشتیان لەژێر ستەمدا چەمیوە و ئازار دەچێژن، هەروەك پێویستە هەوڵ بدەین ئەم ستەم دیدانە ڕزگار بکەین، پێویستە دەستی ستەمکار بگرین و نەهێڵین ستەم بکات، ئەگەرنا خوای پەروەردگار لە دواڕۆژدا تۆڵەیەکی وامان لێدەسێنێت کە لە هەموو ئەو ئێش و ئازارانە کە لە دنیادا بینیومانن زیاتر بێت، دەی چ

١- مسلم، الإمارة، ١٥٧. أبوداود، الجهاد، ١٧. النسائي، الجهاد،٢.

٢- الترمذي، فضائل الجهاد، ٢٦. ابن ماجه، الجهاد،٥.

بەدبەختیەك لەوە زیاترە بەم سەرشۆڕی و ڕیسوایەوە بە پەروەردگاری جیهانیان بگەین.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری پایە بەرزﷺ باسی ئەو بەلاو تەنگژانە دەکات کە ئوممەت توشی دەبێت ، تەنانەت هەموو جارێك هاوەڵێك پرسیار دەکات یا ڕەسول الله ئەمەش ڕوودەدات؟ بە سەرسوڕمانەوە لەو بارەوە پرسیاری لێ دەکات و ، پێغەمبەریشﷺ وەلامی دەداتەوە: بەڵکو لەوەش خراپتر ڕوودەدات...

لەئەبوهورەیرەوە(خوا لێی ڕازی بێت) : پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (كَيفَ بِكُمْ أيها الناس إذا طغى نِساؤكُمْ وَفَسقَ فتيانِكُمْ قالوا يا رَسُول الله إنّ هذا لكائن؟ قال: نعم وأشّدُ منهُ. كَيفَ بِكُمْ إذا تَرَكتُمْ الأمر بِالمَعروف والنهي عَن المنُكَر؟ قالوا: يا رَسول الله إن هذا لكائن؟ قال: نعَم وأشّدُ منهُ كيَفَ بِكُم إذا رَأيُتمْ المنُكر مَعروفاً وَالمَعروفُ مُنكَراً)[1]. ( ئەی خەڵکینە چی دەڵێن ئەگەر ژنەکانتان یاخی بوون و بەندە و ژێردەستەکانتان لە فەرمانتان دەرچوون؟ وتیان یاڕەسول الله ئایا ئەمە ڕوودەدات؟ فەرمووی: بەڵێ لەوەش خراپتر! چیتان بەسەر دێت ئەگەر وازتان هێنا لە فەرمان بەچاکە و ڕێگری کردن لەخراپە ؟ وتیان: یاڕەسول الله ئەمە ڕوودەدات ؟ فەرمووی بەڵێ لەوەش خراپتر! چیتان بەسەر دێت ئەگەر چاکتان بەخراپ زانی و خراپیش بە چاك).

---

١- مسند أبي يعلى ٣٠٤/١١. مجمع الزوائد للهيثمي ٢٨٠/٧-٢٨١.

ئا بەم شێوەیە گرنگی ئەو سپاردە و ئەرکەی لەسەر شانمانە دەردەکەوێت. قولآیی دڵەکانمان و هەستیارترین شوێن و ناسکترین جێگەی لەژێر قورساییەکانی گوناهو تاوانەکاندا کەماوەی سێ سەدەی ڕابردوو کەڵەکە بووە و پلیشاوەتەوە، بەڵکو بەو ئێش و ئازارە زۆرەوە دەناڵێنێ. هیچ چارەسەرێکیش نیە بۆ دەردەکەمان تەنها بە خەباتکردن نەبێت بۆ نەهێشتنی دەردەکە. هەندێ کات چوون بۆ مزگەوت و بەجێهێنانی نوێژەکان و جێبەجێکردنی فەرزی حەج دەبێتە سەرچاوەی دڵنیایی بۆ هەندێکمان. بەڵام ئەو بارەی ئێمەی تێکەوتووە ئەوەندە ناهەموار و نالەبارە تەنها بەجێ بەجێکردنی ئەم فەرزانە لاناچێت. وانازانم ئەو بارە ترسناکەی ئێمە تێی کەوتووین هیچ چارەسەرێکی تری هەبێت جگە لە فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە، کە بەبێ کەم و کوڕی مافی خۆی پێبدرێت، بێگومان جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە شکۆدارە وەك پێویست دەکەوێتە سەر شانی ئێمەش، بەڵێ ئێمە یەك بەیەك، ئەگەرنا لەو کەوتنە خوارەوە و نزم بوونەوەی کە فەرمودە پیرۆزەکە دەستنیشانی دەکات ڕزگارمان نابێت، پەروەردگاری جیهانیان ئاگاداری پێغەمبەری ﷺ کردوە و، فەرموویەتی ئەوە لە ناو ئێوەدا ڕوودەدات ، هەروەك بڵێی وەسفی باری ئەم کۆمەڵگەی ئێستامانی کردبێت .

# بەشی پێنجەم

# بەربەست و لەمپەرەکانی جیهاد

## ١- جیهاد و پاڵدانەوە پێکەوە ناگونجێن

ئەوەی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم مرۆڤدا بۆ ڕاپەراندنی ئەرکی جیهاد بریتی یە لە پاڵدانەوە و دڵخۆشبوون بەژیانی دونیا و چێژەکانی. ئەوەی نەتوانێ واز لە حەوانەوە بێنێت و حەز و ئارەزووەکانی خۆی نەکاتە قوربانی، چاوەڕێی فەرمانبەرداریەکی گرنگی وەك جیهادی لێ ناکرێت. بەڵکو چاوەڕێی جیهاد لە وەها کەسێك گاڵتە جاڕی یە، چونکە کەسێك دەتوانێت کار و فەرمانبەریە بەرز و بڵندەکان جێبەجێ بکات کە هیوا و ئاواتە کەسیەکان و چێژە مادی و مەعنەویەکانی کردبێتە قوربانی.

شەیدایانی ڕێبازی جیهاد ئاوات و خولیایان ئەوەیە کەپاش مردن بگەڕێنەوە بۆ ناو خەڵکی تاکو بە جیهادە بەردەوامەکەیان بەختەوەریان بکەن، بگرە لەوکاتەدا دەرگاکانی بەهەشتیان بۆدەخرێتە سەرپشت و حۆریەکانی بەهەشت پێشوازیان لێدەکەن و "ویلدانی موخەلەدون" وەك یاقوت و مرواری لە بەردەستیاندا پڕاون و بە

خێرهاتنیـان دەکـەن ... هـەر ئـەو عاشـقانەن دەتـوانن ئەرکـە گـرنگ و گەورەکان بەجێ بێنن. ئەم باسەتان بەو ڕووەی کەسەیری دنیا دەکات بۆ ڕوون دەکەینـەوە: بێنە پێش چاوت موجاهیـدێك بـە ئاسـانی ڕێگـەی بـە ئەنـدام بوونی لە پەرلەماندا بۆدەست بدات یان پێشنیاری بۆ بکرێـت کـە ببێتـە سەرۆك وەزیران یاخود سەرۆك کۆمار.. ئـەو –بگـرە ئـا لـەم بارەشـدا– هـەر خزمـەت کردنـی ئـەرکی جیهـادی پـیرۆزی پـێ باشـترە ئەگەرچـی بچوکیش بێت بەسەر ئەم هەموو پێشـنیارانەدا. ئێمـە سـاڵانێکی دوور و درێژە چاوەڕوانی ئەم جۆرە مرۆڤەین. ئەو مرۆڤەی کـە ڕۆحـی جیهـادی هەڵگرتووە و بەعەشقی هەوڵ و جیهاد مەست بووە.

بەڵام ئـەوەی کـە نـاتوانێ قوربـانی بـە هەسـتو نەسـتە مـاددی و ڕێژنـە مەعنەویـەکانی بـدات ، چـونکە هـەر لـە سـەرەتای ڕێـدا بڕیـاری لێبڕانی نەدابێت، هیچ هیوایـەکمان پـێی نیـە بـەڵکو لەمـە دەترسـین و نیگـەران دەبـین توشـی کێشـەو گرفتمـان بکـات کاتێـك لەمەیـدانا دەردەکەوێت، ئەوەی دەست بـەرداری دنیـا و دواڕۆژی نـەبووبێ و وای لێ نەهاتبێ ئەوەشی وازی لێ هێناوە هەر بـە بیریـدا نەیـەت و، هـەموو ئەو چێژ و خۆشیانە لەجیهاددا نەبینێت و نەگاتە عەشقی رەها و چێژی رەها. تا وای لێ نەیەت تەنها لە هەوڵ و جیهادەکەیدا چێژ وەربگرێت و، نەتوانێت بڵێت: (ئای خوایەگیان مردن لەڕێگـەی تـۆدا چـەندە جـوان و شیرینە)... متمانەمان بەجیهادی نییـە و واش نـازانین کـە جیهادەکـەی بەردار بێت و لـە پێنـاو ئیسـلام و ڕزگـارکردنی ئوممەتـدا بێـت. بـەڵکو

متمانه به جیهاد و جیهادی ئەوانە دەکەین کە هەروەك ئەصحابەی کیرام کردیان واز لە حەزەکەسیەکانی خۆیان و حەزە نەفسانیەکانیان دێنن، واز لە ماڵ و وڵاتیان دێنن و بێ ئەوەی ئاوڕ لە هیچ شتێك بدەنەوە. ئا ئەوانە سەرکەوتوون بەسەر ئارەزوەکانیاندا و چێژە ماددیەکاندا. ئەوانەن کە لە مێژە چاوەڕێیان دەکەین و هیواو ئومێدی جیهادیان لێدەکەین و بە هۆکاری چاودێری و کۆمەکی خوایان دەزانین.

بەرامبەر ئەوەش کە چاوەڕوانین و هیوامان پێیەتی، پێویستە ئەوەی کە مرۆڤی ئەمڕۆ بەناوی جیهاد و جیهادەوە دەیکات لەسەر هەمان شێواز بێت و بە هەمان ئاڕاستەدا بڕوات، واتە پێویستە بەپێی هەمان چەمك و بۆچوون جیهاد بکات، لە ڕاستیدا قورئانی پیرۆز هەمیشە شێوازی ئەم جیهادەمان وەبیر دێنێتەوە، خوای گەورە -پاكو بێگەردی هەر بۆ خوایە- دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْءَاخِرَةِۚ فَمَا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِي ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُواْ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔاۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ التوبة: ٣٨ - ٣٩. واتە ڕابن و وشەی حەق بگەیەنن، ژیانی دنیاو ئارەزوە ئاژەڵی و جەستەییەکان بخەنە لاوە لە پێناو گەیاندنی کەلیمەی خوا لە ئاسۆکاندا. بۆچی لەشتان داهێزراوەو قورس بوون و پێتان بە زەویەوە لکاوە و لێی جیانابێتەوە ؟! دەست لە تەماعکاری هەڵناگرن و بەژیانی دنیا قایل

دەبن و لەبەردەمیا چۆك دەدەن؟، ئایا فەزڵی ژیانی دنیا دەدەن بەسەر ژیانی دواڕۆژدا ؟ ئایا دەترسن ژیانی دنیاتان لە دەست دەربچێ، کە لەچاو ژیانی دواڕۆژدا هیچ بایەخێکی نیە. ئەو ژیانە هەر دەڕوات و هەموو ئەوانەش لە دەورتانن لەگەنجیەتی و تەندروستی و ماڵ و سامان هەموو ئاوا دەبن و لە بەرچاو ون دەبن و ناتوانن پارێزگارییان لێبکەن. کاتێکیش لە دەستان چوون و لێیان دوورکەوتنەوە ئاهو حەسرەتیان بۆ دەکێشن ، هەرچۆن بێت دوارۆژ و خانەی هەمیشەیی و نەمری چاوەڕێتانە کە بەخشش و نیعمەتەکانی لەناو ناچن و چێژەکانی کۆتاییان نایەت، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە بینینی جوانیی پەروەردگاری جیهانیان لە هەموو هەفتەیەکدا... دەی کەوایە چۆن قایل دەبن بە ژیانی دنیا و دەیدەن بەسەر ژیانی دوا ڕۆژدا ؟

ئایەتێکی تر هەیە ئاماژە بۆ پاڵدانەوە و تەمبەڵی دەکات کە دەبە ڕێگر و لەمپەر لە بەردەم جیهاددا: ﴿لَوْ كَانَ عَرَضًا قَرِيبًا وَسَفَرًا قَاصِدًا لَّاتَّبَعُوكَ وَلَٰكِن بَعُدَتْ عَلَيْهِمُ الشُّقَّةُ ۚ وَسَيَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَوِ اسْتَطَعْنَا لَخَرَجْنَا مَعَكُمْ يُهْلِكُونَ أَنفُسَهُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٤٢﴾﴾ التوبة: ٤٢.

بەمانای ئەگەر ئەوەی کە بانگی بۆ دەکرێت ئەوە بێت کە قازانج و دەسکەوتێکی نزیکیان دەستگیر ببێت، یان سەفەرێکی نزیك کە حەوانەوە و پشوی تێدا بێت، ئەوکاتە بێ دوودڵی شوێنت دەکەون، بەڵام کارەکە لەگەڵ هەواو ئارەزویاندا نە دەگونجا، چونکە ئەو دەسکەوتە ماددیەی تێدا نەبوو کە ئەوان مەبەستیان بوو، هیچ پلە و

پایەیەکیشیان لەوێدا دەست نەدەکەوت، وێڕای ئەوەش ڕێگاکە زۆر دوور بوو، هەر لەبەر ئەمەیە لێرەدا ئیماندار و دووڕوو بەتەواوی لەیەك جیا دەبنەوە. چونکە ئیماندارەکان بەبێ دوودڵی شوێنت دەکەون، لەکاتێکدا دووڕووەکان هەوڵ دەدەن کە ڕێگەیەك بۆڕاکردن و هۆکارێك بۆخۆ دزینەوە بدۆزنەوە، تەنها بە درۆ کردن نەبێت ئەمەشیان دەستگیر نابێت ، هەر بەمەش خۆیان لەناودەبەن. بە جۆرێك هیچ ڕێگرێك لەبەردەمیاندا نیە بۆ جیهاد ، هەروەك ویژدانیشیان دەزانێت و هەست بەمە دەکات، ئەو بەهانە و بیانوانەش کە دەیهێننەوە هیچ شتێك نابەخشێت تەنها خۆیانی پێ دەخەڵەتێنن. بۆیە ویژدانیان لە دوو دڵی و نا ئارامیدا دەبێت. ئەوەش ویژدانی ئاسودە نەبوو زۆر نزیکە تیا بچێت.

زانینی ئەوکەش و هەوایەی کە باڵی کێشابوو بەسەر مەدینەی مونەوەرەدا پێش جەنگی تەبوك، بایەخی خۆی هەیە بۆناسینی مەوداکانی بابەتەکە. هەر لەبەر ئەمەشە بەکورتی لەو کەش و هەوایە دەدوێن:

ئیمانداران لەسەفەر گەڕابوونەوە، پێویستیان بەهەندێك پشوو هەبوو بۆ ئەوەی بۆ سەفەرێکی نوێ خۆیان ساز بکەن. کاتی کۆکردنەوە و چنینی بەروبوومەکان بوو، کەش و هەوا زۆر گەرم بوو. ئا لەم کاتەدا پێغەمبەرﷺ ئیماندارانی بانگ کرد بۆسەفەر. ئیمانداران بەخۆیان و هەرچی شتی باش و بەنرخیان هەبوو بەدەم ئەم بانگەوازەوە هاتن. گەورەمان حەزرەتی ئەبوبەکر (خوا لێی ڕازی بێت)

هـەموو مـاڵ و سـامانەکەی هێنایـە خزمـەت پێغەمبـەرﷺ، حـەزرەتی عومەری فاروق (خوا لێی ڕازی بێت) نیوەی ماڵەکەی بـۆ ئـەم مەبەسـنە تەرخان کرد، ئەوەی گەورەمان حەزرەتی عوسمان(خوا لێی ڕازی بێت) بەخشی بێ سنوور بوو، بـەڵام گـەورەمان حـەزرەتی عـەلی (خـوای لێـی ڕازی بێت) هەندێك لەماڵەکەی بەنهێنی و هەنـدێکی بەئاشـکرا بەخشـی، بەپێی پەی بردنی تایبەتی خۆی بە ئـیخلاص. ئیمانـدارانی تـریش هـەر یەکە و بەپێی توانای خۆی ماڵ و سـامانی هێنـا. هـەر هـەموو کەوتنـە پێشبڕکێ لەبەخشین و خێرکردنـدا، کەوتنـە پێشـبڕکێ لـە چاکەدا بـە هەموو ئەو شتانەی کە هەیان بوو.

هەروەها ئافرەتانیش بەشدار بوون لەم پێشبڕکێیەدا تاوای لێهـات ژوورەکەی حەزرەتی عائیشە(خوای لێی ڕازی بێت) پڕ بوو لەکەلوپـەلی ئافرەتان چونکە ئەوانیش هەرچی خشڵ و زێڕیان هـەبوو بەخشـیان لـە ڕێی خـوادا. ژن هـەبوو ملوانەکـە و بـازن و موسـتیلەکانی لـەم خـەیرە گـەورەدا پێشـکەش دەکـرد. ئـا بـەم جـۆرە ئیمانـداران بـەدەم بانگەوازەکەی پێغەمبەری سـەردارمانەوەﷺ هـاتن. بـەڵام مونافیقـەکان مـەرجیان دانـا بـۆ بەدەمـەوە چوونی بانگەوازەکـەی پێغەمبـەرﷺ کـە ئەبێت سەفەرەکە دوور نەبێت و کەش و هەوا گەرم نەبێت و کاتەکـەش کاتی چنینی بەر و بووم نەبێت.

هی وایان هەبوو پێشنیارێکی تری دەخستە بەردەم پێغەمبەرﷺ و داوای مۆڵەتی دەکرد وەك (جـەددی کـوڕی قـەیس)کـە هـەرکات گـوێی

لەبانگ بوایە بەزوویی دەچوو بۆ نوێژ، بەڵام نەیتوانی ئیمان لە قـووڵایی دڵیدا بچێنێ و ئیمانەکە بگۆڕێ بۆ گوێڕایـەڵی و لەهـەواو ئارەزووەکـانی نەفسی خۆی داماڵێ و بەرز ببێتەوە و بڕیار بدات کە بەشدار بێت لەگەڵ فیداکاراندا... هات بۆ لای پێغەمبەری ئازیزﷺ، پێغەمبـەرﷺ بەدەسـتی موبارەکی خۆی ئەسپەکەی ڕێـك دەخسـت و ئامـادەی دەکـرد. کاتێـك قەیسی بینی فەرمووی: تەنانەت تـۆش نایـەیت لەگـەڵمان؟ چـونکە ئـەو لەوکەسانە نەبوو کە چاوەڕوانی دواکـەوتنی لێبکـری-ت. بـەڵام ئێسـتا نایەت و خۆی لادەدات. خوای گەورە ئەم سەربەرزیە گەورەیەی خەڵات ناکات، ئەو کەسێکی کەم ئابڕو و چەقاوە سوو بوو، چووە پێشـەوە بـۆ لای پێغەمبـەری سـەردارمانﷺ بـۆ ئـەوەی مۆڵـەتی بـدات و وتـی: (یـا ڕەسـول اللهﷺ خۆزگـە مۆڵتـت بدامایـە و تووشـی فیتنـەت نەکردمایـە، سوێند بەخوا هۆزەکەم دەزانن کە هیچ کەس نیە بەقەدەر من بەژنانەوە سەرسام بێت ، من دەترسم ئەگەر ژنی ڕۆمەکان "قژ زەردەکان" ببینم، خۆمم پێ ڕانەگیرێ). قورئـانی پـیرۆز بـەم ئایەتـە پـیرۆزە ئـەم کـارەی ئاشکرا دەکات:

﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ائْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّي أَلَا فِي الْفِتْنَةِ سَقَطُوا وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةٌ بِالْكَافِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾ التوبـة: ٤٩. هەنـدێکی تـر هاتن و وتیان: ﴿لَا تَنفِرُوا فِي الْحَرِّ﴾ التوبـة: ٨١ (لـەم گەرمایـەدا دەرمەچـن)، وەڵامی پێغەمبەرﷺ بۆیان، وەڵامی قورئان بوو: ﴿قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا لَّوْ كَانُوا يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾﴾ التوبة: ٨١. ( بێژە ئەگەر تێگەیشتنیان هەبوایـە خـۆ

ئاگری دۆزەخ زۆر گەرمترە...) ئەوانەی لێرە تەنگژیان بینی و ئێش و ئازاریان چەشت و تاڵاو چوو بە قورگیاندا، لەوێ لە ئاگر پارێزراون، بەڵام ئەوانەی ژیانیان لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا بەسەر برد لەوێ بەر ئاگر دەکەوون: ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُمْ بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنْتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنْتُمْ تَفْسُقُونَ (٢٠) ﴾ الأحقاف: ٢٠. (بیر لەو رۆژە بکەنەوە کە کافران ئەبرێنە بەر ئاگری دۆزەخ وپیشانی ئەو ئاگرە ئەدرێن و پێیان ئەوترێ: ئێوە نازو نیعمەتی خۆتانتان هەر لەژیانی دنیاتانا بۆ خۆتان بردو لەزەتتان لێ وەرگرت. ئەمڕۆ ئیتر ئەو سەردەمە بەسەر چووە. دەی سزای خۆتان وەرگرن کەمایەی سەرشۆڕی و سەفیلیتانە، بەهۆی ئەوەوە کە لە دنیادا خۆتان بەناحەق بەزل ئەزانی و فەرمانی خواتان بەجێ نە ئەهێناو لە ئەستۆتان نە ئەگرت).

بەڵێ، قورئانی پیرۆز گشت ئیمانداران بۆجیهاد هەڵدەنێ. ئیدی بە پێی بەدەمەوە چونمان بەدەم ئەم بانگەوازە یان لە سەرکەوتن سودمەند دەبین، یاخود لە دۆڕاو و زیانباران دەبین. ئەویش یان وەك مونافیقەکان دەڵێین: واز هێنان لەم چێژ و لەزەتانەی ئەم دنیا زۆر گرانە ، یان وەك کار و پیشەی ئەصحابە بەرێز و پێشەوا جوامێرەکانمان ، هەرچیەکمان هەیە دەیهێنین و خۆمان بۆ جیهاد ئامادە دەکەین.

## چەند نموونەیەك لە پێغەمبەری سەردارﷺو، ئەصحابە خاوێنەكانی سەبارەت بە وازهێنان لە تەمبەڵی و پاڵدانەوە

لەپێناوی سەرفرازی دنیاو دوا ڕۆژدا پێغەمبەری سەردارمانﷺ ماڵەكەی خۆی و خانەی خوای گەورە كە "كەعبەی شەریفە" و چەقی گۆی زەویە بەجێ دەهێڵێت، مەككە بەجێ دەهێڵێت كە لە ئامێزیا ژیا و، فەیزی پیرۆزی خواوەندی لەكەش و هەواو دۆڵ و شاخەكانی مەككەدا دەست كەوت و دەسگیری بوو، ئەشكەوتی حەرای بەجێ هێشت كە لەوێدا دەستی لەملی ئاسمانیەكان دەكرد... هەموو ئەمانە بەجێ دەهێڵێت و فێرمان دەكات كە پێویستە ئیماندار لە پێناو بانگەوازێكی پیرۆز و مەزندا واز لە بەنرخترین شتی خۆی بهێنێت. كاتێك هۆزەكەی لە "مەككەی موكەڕەمە" دەریان كرد، ڕۆحی زۆر ئازاری نەدەدا بۆئەوشتانەی كە بەجێی هێشتوون، بەڵكو بە نەشوە و هیواوە دەیڕوانیە ئەوەی كە لە ئاسۆكانی ئایندەدا دێتە ڕێی .

دوژمن پیلانیان دادەنا و هەنگاو بەهەنگاو چاودێریان دەكرد و لەهەموو لایەكەوە بە چەشنی ئەڵقەی ئاگر دەورە درابوو ، تا ناچاربوو لە ئەشكەوتی(ثور)دا خۆی بشارێتەوە، ئالێرەوە هەڵگری هەمیشەیی بانگەوازی مەزن ڕوو دەكاتە مەدینەی منەوەرە بۆئەوەی قەڵایەكی بەرز بنیات بنێت و بە گشتی پێشوازی لە مرۆڤایەتی بكات ، لەبەر ئەم كارە لە هەموو كات و ساتێكدا لە باوەشی مردنێكی نوێدا گەشتی دەكرد بە جۆرێك لە هەموو قوشبنێكدا و لە گشت مەیدانێكدا ڕووبەڕووی مەرگ

دەبویەوە. بەلام ئەم هەموو بەربەستانە نەیانتوانی توشی دڵە تـەپێ و شـڵەژانی بکـەن. بگـرە کاتێـك قـاچ و قـولی دوژمنـان دەبینـران لـەو ئەشـکەوتەی کـە خـۆی تیـادا حەشـار دابـوو ، گـەورەمان حـەزرەتی ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێ) دڵە تەپێی بوو لـە ترسـی ڕەسـول اللهﷺ، بەلام ئەو لە ترۆپکی دڵ ئارامیدا بوو، هەروەك حەزرەتی ئەبوبەکر(خـوا لێی ڕازی بێ) وەسفی دەکات: (بـەجۆرێك ئـارامی و ئاسـودەیی پیشـان دەدا دەتگوت لە نێوان هاوەڵە ئەمین و باوەڕ پێکراوەکانیدایە). پاشان چی وای لێـدەکات لـە دڵەتـەپێ و نائارامیـدا بێـت؟ خـۆ ئەگـەر خـودای گەورە بیەوێت لە دنیادا بیباتەوە ئەوا لـە دەسـت قورسـی و گرانیـەکی گەورە ڕزگاری دەکات و دەینرێ بۆ جیهانێك کە پڕیەتی لە حەوانـەوە و دڵ ئارامی، ئـیتر بـۆ بشـڵەژێ؟ ئایـا ڕزگـاری نـەدەبوو لـە جیهانێـك کـە هـەموو شـتێك تیایـدا فـانی یـە بـۆ جیهانێـك کـە هـەموو شـتێکی نـاوی دەمێنێتەوە و باقیە، ئایا هەمیشـە و بـەردەوام خـودای لەگـەڵ نـەبوو؟ ئایا خـودا نایبینـێ و لـە هـەموو بـارو دۆخ و لەهـەموو کـات و سـاتێکدا ئاگاداری نیە؟ هـەر لەبـەر ئەمـە بـوو بـە ئەبوبـەکری فـەرمو: (مـا ظنـك بـإثنین الله ثالثهمـا) بـەواتای ئایـا وا گومـان دەبـەی کـە محەممـەد و ئەبوبەکر تەنیان؟ خودای بالادەستمان لەگەڵدایە، ئابەم جۆرە وەلامـی حـەزرەتی ئەبوبـەرکری دایـەوە ئـەو هـەرگیز نەدەترسـا، بـەڵکو ئەگـەر هـەموو خـەڵکی دنیـا بەربـەرەکانێیان لەگـەڵ کردبـا هـیچ بـاکی نـەبوو، خەمی نەدەخوارد و هەرگیز دنیا نەیدەتوانی دەستی بەو بگات ، هەموو

خەڵكی پشتی لێ هەڵكردایە بە حەزرەتی ئەبوبەكریشەوە ئەوەندە متمانەی بە خودا هەبوو كە دڵی لێوان لێو بوو بەوەی كە خوای گەورە بەسەربازانێك پشتگیری دەكرد كە ئێمە نایانبینین.

بەڵێ، ئێمە نازانین ئەم سەربازانە چۆنن بەڵام ئەم حەقیقەتە دەزانین كە: پێغەمبەری سەردارمانﷺ چەندین جار بە سەربازانی خوا كۆمەك و پشتیوانی كراوە، جەنگی بەدری گەورە سرودی ئەم پشتیوانی و كۆمەكیەیە. هەروەك بەو هاوەڵەی بەشداری بەدری كردبێت پێی دەوترێت "بەدریی" بەهەمان جۆر بەو فریشتەیەی كە بەشداری بەدری كردبێت دەوترێت"مەلائیكەی بەدر" موعازی كوڕی ڕیفاعەی كوڕی زروقی لە باوكیەوە، (كە لە ئەهلی بەدر بووە) دەگێڕێتەوە: حەزرەتی جوبرەئیل هاتە لای پێغەمبەر[1]ﷺ فەرموی: ئێوە لە ناوخۆتاندا چۆن تەماشای ئەهلی بەدر دەكەن؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: لە چاكترینی موسوڵمانانن، یان وشەیەكی لەم جۆرە. حەزرەتی جوبرەئیل فەرموی: هەروەها ئەو فریشتەیەی بەشداری بەدری كردبێت هەر بەو جۆرەن.

ئەصحابەیەكی بەرز و شكۆدار بەم جۆرەی خوارەوە وەسفی یەكێك لەو پاڵەوانیەتە كەم وێنە و ناوازانە دەكات: لەكاتێكدا پیاوێكی

---

١- (عَنْ مُعَاذِ بْنِ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ الزُّرَقِيِّ عَنْ أَبِيهِ وَكَانَ أَبُوهُ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ قَالَ جَاءَ جِبْرِيلُ إِلَى النَّبِيِّﷺ فَقَالَ: مَا تَعُدُّونَ أَهْلَ بَدْرٍ فِيكُمْ؟ قَالَ: مِنْ أَفْضَلِ الْمُسْلِمِينَ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا. قَالَ: وَكَذَلِكَ مَنْ شَهِدَ بَدْراً مِنَ الْمَلَائِكَةِ) البخاري، فضائل أصحاب النبي، ١١.

موسوڵمان بەدوای موشریکێکدا ڕایدەکرد گوێی لە دەنگی قامچی بوو بەسەر سەریەوە و سوارەکەش دەیوت بەرەو پێش برۆ (خەیزوم ) ناوی ئەسپی ئەو مەلائیکەتە بوو، کاتێك موسوڵمانەکە روانی بۆ موشریکەکە بینی وا لەبەردەمیدا کەوت بە پشتا، کەلێی ووردبوویەوە دەبینیّ وا بەشێوەی لێدانی قامچی، داویەتی لە ناوەڕاستی لوتی و دەم و چاوی لەت کردووە وەك جێ قامچی دەرکەوتووە... کاتێك ڕووداوەکەی بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: (خەیزوم) ناوی ئەسپی جوبرەئیلە، ئەوەش بە قامچیەکە لێیداوە ئەو بووە حەزرەتی جوبرەئیل(سەلامی خوای لێبێت) مێزەرێکی زەردی وەك مێزەرەکەی زوبەیری کوڕی عەوام(خوا لێی ڕازی بێت) بەستبوو، بەڕاست و چەپ دا لە بت پەرستانی دەدا.[1]

لە جەنگی ئوحوددا پێغەمبەرﷺ بۆ موصعەبی کوڕی عومەیر دەگەڕا، موصعەب لەبەردەمیدا جەنگی دەکرد کاتەکە نزیکی خۆرئاوا بوون بوو، کافرەکان هەڵهاتن و پێغەمبەرﷺ فەرموی: (موصعەب وەرە پێشەوە) بەڵام ئەوەی ئەو بە موصعەبی زانی، مەلائیکەتێکی بەڕێز بوو، وتی: من موصعەب نیم ئەی پێغەمبەری خواﷺ.

لەمەوە تێدەگەین کە خوای گەورە چۆن بە مەلائیکەت کۆمەك و پیشتوانی کردوون، بەڵێ خوای گەورە دەست بەرداری

---

١- مجمع الزوائد للهيثمي، ٦/٨٣

خۆشەویستەکەی نابێت کە پێغەمبەرەﷺ و هەرگیز دلگرانی ناکات[1].
لە(حونەین)یشدا لەوساتە زۆر ناهەموارەدا خوای گەورە بە فریشتەکانی پشتیوانی لیّ کرد.[2]

زۆربەی ئەوانەی کە لە جیهاد دوا دەکەون لە ترسی لە دەست چوونی ژیانە، لە کاتێکدا ئەوانەی لەم ڕێگەیەوە هەنگاو دەنێن و ڕێگە دەبڕن، خوای گەورە دەست بەرداریان نابێت و بە تەنها جێیان ناهێڵێت، هەروەك پێشەوای گەورە و فەخری هەردوو جیهانی لە نالەبارترین کات و ساتدا بەجێی نەهێشت.

ئەوەی کە بە تەواوی خۆی بە خوا سپاردبێت، بچوکترین دڵەڕاوکێ و نیگەرانی رووی تیّ ناکات و بە هیچ جۆرێك ناشڵەژێ چونکە باوەڕی وایە و دەڵێ:"من ئیمانم بەخودایە، خوا لەگەڵ منە،کەواتە پێویست بە دڵەڕاوکێ و شڵەژان ناکات، هیچ شتێکیش نامترسێنیّ مادام ئەو خوایە پشت و پەنامە کە جگە لەو هیچ خوایەك نییە، هەموو موڵك و توانای ڕەها هی ئەوە و هەر ئەوە سەرم دەخات). کەواتە بە دەردی جولەکەکان بۆ چاڵی تیاچوون و دوودڵی گل نابێتەوە ، جولەکەکان کاتێك داوایان لێکرا کە هەموو دەرچن بۆ جیهاد، ئەوان لە فەرمانی پێغەمبەرەکەیان سەرپێچیان کرد و بەبیّ هۆ توشی دوودڵی بوون و بیّ متمانەییان بەخوای بەرز و باڵادەست دەربڕی. دواکەوتنیشیان لەجیهاد

---

١- أنظر إلى: سورة الضحى:٣

٢- أنظر إلى: سورة التوبة:٢٦

لەبەر ترسێکی بێ مانا بوو هیچ کەڵکی پێ نەگەیاندن ئەوە نەبێت کە ئەوەی لێی دەترسان هاتەڕێیان. هاوکات بە پێچەوانەی ئامانج و مەبەستی خۆیان زللەی تەمێ کردنیان لێدرا ، چل ساڵ لە بیاباندا وێڵ و سەرگەردان بوون.

ئێمەش ئەگەر دەمانەوێت لەو وێڵی و سەرگەردانی و پشێویەی کە بەدرێژایی سێ سەدەی ڕابردوو چەشتمان ڕزگارمان بێت، لەسەرمان پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ناسنامەی ڕەسەن و کەسایەتی خۆمان لە ژێر پەروەردەی حەقیقەتی ئەحمەدیداﷺ، هەوڵ بدەین لەگەڵ ئیسلامدا تێکەڵ ببین.. بەڵێ، هەوڵ دەدەین بۆ ئەوەی خوای گەورە ڕزگارمان بکات لەوەی کە لێی دەترسین و تیایدا شڵەژاوین. خوای گەورە سەربەرز و ڕێزدارمان دەکات هەتا زۆر پشت ئەستور نەبین بەسوودە ماددیەکان و نەیانکەینە ئامانج و خۆشویستنیان لەدڵماندا جێگیر نەبێت و سەری زەلیلی شۆڕ نەکەین لەبەردەم ئاواتەکانی دنیادا، بەڵکو پشتیان تێبکەین و ڕوو لەچێژ و حەزەکانی وەرچەرخێنین.

کەسی واهەیە لە پێناو خۆشی و چێژەکانی دنیایدا دواڕۆژی دەکاتە قوربانی، کەسی واش هەیە هەموو دنیای خۆی لە پێناو دواڕۆژیدا دەخاتەکار. ئیماندار ئەمەیانە، ئەو"ئیماندار"ە هەرچییەك لە دنیادا خوا پێی بەخشیوە لە لەڕێگەی ئاوەدانکردنەوەی دوا ڕۆژیدا خەرجی دەکات. ئیمادار ئەوەیە کە بۆ دینەکەی بژی، کاتێك دین باڵادەست بوو بەسەر هەموو جیهاندا و سەرزەوی کەوتە ژێر

فەرمانڕەوایەتیەکەیەوە ئەو کاتە ژیان مانایەکی دەبێت. گەر نا بـژێوی ژیانی دنیای بارێکی قورسە، ئیماندار حەزی لـەم تـەرزە ژیانـە نیـە کـە دیـن باڵادەسـت نـەبێت تیایـدا. بـەڵکو دەڵـێ: "نـەفرەت لـەم ژیانـە!" ئیمانداری ڕاستەقینە هەمیشە بـەم ئـاوازە دەچـریکێنێ و زایەڵـەی ئـەم گوتەیەی لە گوێدا دەزرنگێتەوە:

"بێگومان تەنانەت دواڕۆژیشم کردۆتە قوربانی لە پێنـاو بەدەسـت هێنانی سەلامەتی ئیمانی کۆمەڵگەدا، لەناو دڵم دا نە حەزی بەهەشـت و نە ترسی دۆزەخ هەیە، دەی با نەك یەك سـەعید، بـەڵکو هـەزار سـەعید ببنە قوربانی، تەنها لە پێناو ئیمانی کۆمەڵگەی تورکیدا نا، کە دەگەنـە بیست ملیۆن بەڵکو لە ڕێـی ئیمـانی کۆمەڵگـەی ئیسـلامیدا کـە دەگەنـە سەدان ملیۆن. ئەگەر کۆمەڵێ نەبن کە بەیداخی قورئانەکـەمان هـەڵگرن لەسەر ڕووی زەویدا، ئەو کاتـە حـەزم لـە هـیچ شـتێك نیـە تەنانـەت لـە بەهەشتیش، چونکە بەهەشتیش دەبێتە بەندیخانەیەك بۆم، خـۆ ئەگـەر ئیمانی ئوممەتەکەمان سـەلامەت و بـاش بـوو مـن ڕازیـم کـە لـە ئـاگری دۆزەخدا بسوتێم، چونکە لەوکاتەدا جەستەم دەسوتێ دڵم لە خۆشـی و کامەرانیدا سەما دەکات".[1]

ئەمانە وتەی کەسێکن کـە بـەرزو بڵنـد بووەتـەوە بەسـەر حـەز و ئارەزووەکانی نەفسی ئـەممارەدا، گومـانی تێدا نیـە هەرکـەس بەسـەر

---

١- سيرة ذاتية لبديع الزمان سعيد النورسي، ص: ٤٥٧.

حەز و ئارەزووەکانی نەفسیدا سەرکەوێت هیچ شتێك ناتوانێت لە ئامانج و مەبەستەکەی لای بدات و رێی لێ بگرێت .

## ٢- جیهادو سوك سەیرکردنی ژیان

بەکەم زانینی ژیانی دنیا و سوك سەیرکردنی پلەیەکی بەرزترە لە وازهێنان لە پاڵدانەوە و حەوانەوە کە ئەمەش مەرجێکی ترە بۆ کەسێك کە دەیەوێ جیهاد بکات لەرێی خوادا لە چوارچێوەی رەزامەندی خواوەندو بەو جۆرەی کە خودا دەیەوێت. بەڵێ ئەو کەسانەی ژیانی دنیایان زۆر لابەنرخەو ناتوانن دەستبەرداری ببن و ژیانی دواڕۆژیان وەکو دنیا لا ڕوون نیە و نایبینن، زۆر ئەستەم وسەختە کە بتوانن بۆجیهاد بژین بە هەموو رەهەندەکانیەوە ، بەڵگەش بۆ ئەمە سەردەمی زێڕینی پێغەمبەرە ﷺ:حەزرەتی عەلی(خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێت: کاتێك خەڵك دەوری پێغەمبەریان ﷺ چۆڵ کرد لە ڕۆژی ئوحوددا، سەیری کوژراوەکانم کرد پێغەمبەرم ﷺ نەبینی ، وتم: سوێند بە خوا ئەو لە جەنگ هەڵنایەت و لەکوژراوەکانیشدا نیە، وادەزانم بەو کارەی کردمان خوای گەورە غەزەبی لێگرتووین، پێغەمبەرەکەی لە ناوماندا بەرز کردوەتەوە. لەوە چاکتر نیە کە جەنگ بکەم هەتا ئەکوژرێم، جەنگم کرد هەتا کیلانی شمشێرەکەم شکا، پاشان هێرشم کردە سەر خەڵکەکەو، کەلێنێك کەوتە ناویان بینیم پێغەمبەر ﷺ وا لەناویان دا.[1]

---

١- مسند أبي يعلى ٤١٥/١، وانظر إلى: حياة الصحابة للكاندهلوي ٥١٦/١، الإصابة لابن حجر ١٩١/١، صفة الصفوة لابن الجوزي ٣١٢/١

ئێمە ناچارین لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەشداری بکەین و بەبێ کۆڵدان بەردەوام خەریکی جیهاد بین و، بەتەمای هیچ دەسکەوتێك نەبین جگە لە ڕەزامەندی خوای گەورە و، بارگاوی بین بەو هەستەی کە " لە دڵمدا حەزی بەهەشت و ترسی دۆزەخ نیە " (واتەتەنها مەبەستمان رەزامەندی خوایە) وە پێویستە لە سەرمان کە بەرزترین و پیرۆزترین ئامانجمان قوربانیدان بێت لەم ڕێگایەدا بەو شتەی کە هەمانە ، ئەوە دووبارە بکەینەوە کە(ثابتی کوڕی دەحداح) کاتێك کە موسڵمانەکان لە بارێکی نالەباردا بوون لە ڕۆژی ئوحوددا وتی: (ئەی کۆمەڵی ئەنصار وەرن ، بێن بۆ لام، ئەگەر پێغەمبەرﷺ کوژراوە، خۆ خوا زیندوە و نامرێ، دەی لە پێناو دینەکەتاندا بجەنگێن). پێویستە هەر وەك ئەو دنیا بەجێ بێڵین، لە کاتێکدا بۆن و بەرامەی بەهەشتی هەست پێ دەکرد لە ئوحوددا بە خەندەوە دنیای بەجێ هێشت.

بەکەم سەیرکردنی ژیانی دنیا لە هەموو لایەنەکانیەوە و دانانی هاوسەنگیەك لە نێوان دنیا و دوارۆژدا بەوە دەبێت هەریەکەیان پلەو پایەی شیاوی خۆی بدرێتێ، ژیانی نمونەیی و شیاو بۆ موسڵمان بەم شێوەیە، چونکە دوای دانانی ئەم هاوسەنگیە گرێی هەموو شتەکان دەکرێنەوە، گرنگ ئەوەیە کە لەکاتی روو بە روو بوونەوەی دنیا و دوارۆژدا یەکەم جار کامەیان هەڵدەبژێرین، بە دانانی ئەم هاوسەنگیە دەردەکەوێ چەندە سەنگ و قورسایی لە ویژدانماندا جێدێڵین، ئەمەش

بەوە دەبێ دنیا بە پێی بەهای خۆی و دوا ڕۆژیش بە پێی نرخ و بەهای خۆی هەڵسەنگێنین.

ئەوانە دەتوانن ئەم پێوانە و هاوسەنگیە بپارێزین کە هیچ ترس و دوودڵیەك نزیکیان نابێتەوە و ئەگەر دنیاش بەسەریاندا بتەقێتەوە بەهیچ شێوازێك ناشڵەژێن، چونکە ترس و بیم و دڵەڕاوکێ لەوەوە پەیدا دەبێت کە مرۆڤ عاشق و پەیوەست بێت بە دنیاوە ، بەڵام ئەوان ژیانی دنیا بەکەم دەزانن، دڵەڕاوکێ و شڵەژان ڕوو لە کەسێك ناکات کە بزانێ دنیا فانی و کاتی یە، قازانج و سەرکەوتن لە دوارۆژدایە، کەواتە پێویستە هەوڵ و تەقەلا بۆ بەدەست هێنانی بدرێت، چونکە شەوق و تاسەمەندی بۆ دوا ڕۆژ سەرچاوەیەکی بەهێز و موبارەکە بۆ ئازایەتی و بوێری...

سەیری ئەم نمونەیە بکەن: موسڵمانەکان لە ئوحوددا حەفتا شەهیدیان کردە قوربانی ئەوانی تریش زۆرێکیان بریندار بوون، ئا بەم شێوەیە گەڕانەوە بۆ مەدینە، تەنانەت پێغەمبەرﷺ بەهۆی ئەو برینەی لەسەریدا بوو سەری بەستبوو ، هەموان هێز و تینیان نەبوو کە چەك هەڵبگرن، لەم کاتەدا هەواڵێك بڵاوبویەوە کەگوایە ئەبوسوفیان و سوپاکەی دەگەڕێنەوە و جارێکی تر دەدەن بەسەر مەدینەدا، کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا بە دەرچون و شوێن کەوتنی دوژمن، فەرموی: (هەرکەس دوێنێ لەگەڵمان ئامادە نەبووە با ئەمڕۆ لەگەڵمان نەیەت). تەنها یەك کەس لەو فەرمانە دوا نەکەوت،

لەگەڵ ئەوەدا هی وا هەبوو قاچێکی پەڕیبوو هی تریش دەستێکی پەڕیبوو، بەڵام هەر هەموو لە شوێنی دیاریکراودا ئامادەبوون، بگرە هی وایان هەبوو بە سکەخشکێ هاتبوو لەبەر ئەوەی کارەکە دەرچوون بوو بۆ جیهاد، هیچ ئەصحابەیەك لە کونجوڕێکدا دانەنیشت و دوا نەکەوت، چونکە هیچ کام لەوان نە دەترساو، نە لاوازی کاری تێدەکرد، هەرچەندە جەستەیان پڕ برین بوو، بە جۆرێکی وا توانای لێ بڕیبون، بەڵام ڕۆحیان بە باڵی شەوق و تاسەوە دەفڕی، قورئانی پیرۆز ئەم بارو دۆخەی ئەوانمان بۆ دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ:

﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٧٣.

ئەم دەرچونە کاریگەری لەسەر ڕیزی دوژمن هەبوو بەجۆرێکی وا پشتیان هەڵکرد و هەڵهاتن و ئاوڕیان بەلای هیچ شتێکدا نەدایەوە، چونکە وا گومانیان برد کە موسڵمانەکان کۆمەکی تازەیان بۆ هاتووە و کەوتوونەتە شوێنیان، بەم شێوەیە شێرئاسا جەستەیان پڕ بوو لە برین بەو بوێریەیان چەند دێڕێکیان بە ئاڵتون لە مێژوو نوسیەوە، لە کۆتاییدا موسڵمانان لە(ئوحود)یشدا سەرکەوتن،[1] بەڕاستی هەمیشە موسڵمان سەرکەوتووە، چونکە یەکێ لەم دوو شتە چاکەی دەست دەکەوێت: یان شەهید دەبێ و سەردەکەوێ، یان موجاهیدە و سەربەرزی و کەرامەتی پارێزراو دەبێت و ئەوەشیان هەر سەرکەوتنە.

---

١- البداية والنهاية لابن كثير ٤/٤٩.

لێرەدا شتێك باس دەكەم كە خۆم بینیومە: لەو ڕۆژانەدا كە تیرۆر دەستی بەسەر وڵاتدا كێشابوو، تەنانەت وای لێهات ئیرهابیەكان ئەو ئۆتۆمبیلانەیان دەپشكنی كە تێدەپەڕین و دەیانكردنە قەڵغانێك بۆ خۆیان بەرامبەر بەهێزی سوپا و پۆلیس، كاتێك ویستیان ڕێ بە بارهەڵگرێك(شاحنة) بگرن و بیكەنە قەڵغان، شۆفێری بارهەڵگرەكە -نازانین ڕادەی دین و ئیمانی چەندە بوو- لێیان هاتە دەست و شتێكی وەهای پێ نەبوو تەنها گۆچانێكی ئەستور نەبێ، بیست كەس لەو گێرەشێوێن و ئیرهابیانەی پەرت و بڵاوە پێكرد بەڵام چۆن پەرت و بڵاویەك، ئا بەم شێوەیە موسڵمان ناچارە كە پارێزگاری لە سەربەرزی و كەرامەتی بكات و، وەك ئەو شۆفێرە جەسارەت بنوێنێ بۆ پاراستنی ماڵ و سامان و شەرەف و كەرامەتی، پێویستە موسڵمان بزانێ چۆن بەرامبەر بە دوژمنان هەڵس و كەوت دەكات، خۆی ناخاتە ژێر دەستی تیرۆرست و ئیرهابیەكان و لە ماڵەكەیدا سەری داناخات و بەترس و لەرزەوە بژی، بەڵكو لەسەری پێویستە كە هاوكاری خێربێت و كۆمەكی حەق بكات.

بۆ ئەوەی مەیدان فراوان نەبێت بۆ ڕاڤە و تەئویلە هەڵەكان، پێویستە شتێك ڕوون بكەمەوە: من بەكەس ناڵێم -هەركەس بێت- خۆتان پڕچەك بكەن و بچنە ناو شەقام و كۆڵانەكان، بەهیچ جۆرێك ئەمە ناڵێم، بەڵكو مەبەستم ئەوەیە كە نابێت ترس و بیم و دڵە ڕاوكێ بە هیچ شێوەیەك توخنی كەسێك بكەوێت كە ئیمانی بە خوای گەورە

هەبێت، ئەگەر ویستمان ئەمە بە نموونە ڕوون بکەینەوە سەردارمان زوبەیری کوڕی عەوام لە پێشەنگی ئەم نموونە و کەسانەدا دەبێت: ڕۆژێك هەواڵێکی سەر سوڕهێنەر هەموو کۆڵانەکانی مەککەی هەژاند و خەڵکی توشی شۆك کرد، پڕوپاگەندەیەك بڵاوبویەوە کە محەممەدی ئەمینﷺ کوژراوە، هەموو کەوتنە بارێکی ناهەموار و تاساو بەجۆرێك نەیاندەزانی چی بکەن، بێجگە لە منداڵێك کە تەمەنی لە دوانزە ساڵ تێپەڕی نەدەکرد لەم کۆڵان بۆ ئەو کۆڵان ڕای دەکرد و شمشێرێکی بەدەستەوە بوو ڕایدەکێشا، ئەم منداڵە زوبەیری کوڕی عەوام بوو، کە پاش ماوەیەك نازناوی حەواری پێغەمبەریﷺ وەرگرت، کە کوڕی صەفیەی پوری پێغەمبەرەﷺ، ئەویش بەوەی کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: (إِنَّ لِكُلِ نَبِيٍّ حَوَارِيّاً وَحَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ)[1]، (هەموو پێغەمبەرێك حەواری و قوتابی هەیە حەواری منیش زوبەیرە). وەك دێوانە لێرە و لەوێ هاتووچۆی دەکرد، کەسیش نەیدەزانی نیازی چی یە. لەکۆتاییدا لە یەکێ لە کۆڵانەکاندا لە بەردەم پێغەمبەرداﷺ خۆی بینیەوە و پێی فەرمو: (زوبەیر ئەوە بۆکوێ دەچی ؟) زوبەیر شڵەژا، چونکە وایدەزانی گەورە و سەرداری هەردوو جیهانﷺ کوژراوە، وتی دەچم ئەوکەسە دەکوژم کە تۆی کوشتووە ! پێغەمبەرﷺ بە زەردەخەنەوە لێی پرسی: (ئەوەی کە ویستی من بکوژێت بەچی دەیکوژیت؟) لە کاتێکدا کەخەریك بوو نەتوانێ بەیەك دەست شمشێرەکە بەرز بکاتەوە ناچار

---

١- البخاري، الجهاد، ٤١. مسلم، فضائل الصحابة، ٤٨.

بوو بە هەردوو دەستی بەرزی بکاتەوە و وتی: بەم شمشێرە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵێ، زوبەیر چوو بۆ ناو کۆڵانەکانی مەککە و شمشێرێکی هەڵگرتووە کە نایتوانێ، چونکە دەزانێ ژیانێك خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ لە خۆ نەگرێت هیچ بەهایەکی نیە، ژیانی هیچ کەسیش دوای ژیانی ئەو ئەرزشێکی نیە.[1]

لە یەمامەیش دا دیمەنێکی تری بەکەم سەیر کردنی ژیان دەبینین، دیمەنی کەسێك کە بە سام و هەیبەتەوە ڕووی کردبێتە دوارۆژ، عەمماری کوڕی یاسر تەمەنێکی بەسەر بردبوو، لەگەڵ ئەمەشدا نەیوت: (من پیر بووم و هیچ گوناهێکم لەسەر نیە)، جەنگ هەڵگیرسا و بڵێسەی جەنگ و بریسکەی شمشێرەکان تاوی سەند و لای ڕاست و چەپی سوپای موسڵمانان کەلێنی تێکەوت... لەو کاتەدا موسڵمانەکان دەنگێکیان بیست لایان نامۆ نەبوو، پێی وتن: (موسڵمانینە ئایا لە بەهەشت ڕادەکەن؟ ئەوە منم عەمماری کوڕی یاسر).

عبداللهی کوڕی عومەر(خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: عەمماری کوڕی یاسرم (خوا لێی ڕازی بێ) لە جەنگی یەمامەدا بینی لەسەر تاشە بەردێك بانگی دەکرد ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ئایا لەبەهەشت ڕا دەکەن؟ من عەمماری کوڕی یاسرم وەرن بۆلام منیش سەیری گوێیم کرد بڕابوو و شۆڕ بوو بوویەوە، جەنگێکی زۆر بوێرانەی دەکرد.[2]

---

١- أسد الغابة لابن الأثير ٢/٢٥٠. كنز العمال للهندي ١٣/٣١١.

٢- أسد الغابة لابن الأثير٤/١٣٤، حياة الصحابة للكاندهلوي ٢/٤٥ .

بەڵێ سەرداری سوپای هەرقل ڕاستی دەکرد کاتێك بە هەرقلی وت: (ئەی پاشا توانای ئەمانەمان نیە، چونکە ئەوان بە پەرۆشن و سوورن لە سەر مردن هەروەك پەرۆشی ئێمە بۆ ژیان! دوا ڕۆژیان خۆش دەوێ هەروەك چۆن ئێمە ژینمان خۆش دەوێ) عەممار لە یەمامەدا بەو پلەیە نەگەیشت کە تامەزرۆی بوو ، بێگومان پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو بوو: ( إنّ آخر شراب تشربه لبن..)[١]، (کۆتا شتێك کە دەیخۆیتەوە شیرە) عەمماریش تامەزرۆی ئەم شیرە بوو، نەیدەزانی ئەو شیرە لە موئتەیە یان لە یەرموك یاخود لە یەمامەدایە، ئیتر جەنگ لە دوای جەنگ بەشداری دەکرد، بەڵام لەم هەموو جەنگانەدا مردنی بە نسیب نەبوو تا گەیشتە جەنگی(صەفین) لە ڕیزی سەردارماندا حەزرەتی عەلی(خوا لێی ڕازی بێ) جێی خۆی گرت لەو کاتەدا تەمەنی لە نەوەدساڵ تێپەڕی کردبوو، هەر هەموو سەری سپی بوو بوو، تاڵێ موی ڕەشی تێدا نەدەبینرا، هەروەك پارچەیەك لە نوور بێت وابوو، هەتا ئێوارە جەنگی کرد، لەوکاتەدا وتی: "شتێکی خواردنەوەی لێ نییە" جامێك شیریان بۆ هێنا کاتێك شیرەکەی بینی بە خۆی وت: ئەمە کۆتا ڕۆژی تۆیە ئەی عەممار، چونکە بەم جۆرە لە پێغەمبەرمﷺ بیستوە، دوای کەمێك خەڵکەکە بینیان لەگەڵ ئاوابونی خۆردا خۆرێکی تر ئاوا بوو، بەڵام ئەم خۆرەیان لە بەرزاییەکانی بەهەشتداجارێکی تر هەڵدێتەوە، عەممار نەیدەزانی مردن چی یە چونکە یەقینی هەبوو کە

---

١- الطبقات الكبرى لابن سعد ٢٥٦/٣. كنز العمال للهندي ٥٢٦/١٣ - ٥٢٧.

ئەجەل یەك چرکە پێش و پاش ناکات.[1] قورئانی پیرۆز بەم فەرمایشتە ئەم حەقیقەتە روون دەکاتەوە ﴿ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَـٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ ﴾ آل عمران: ١٤٥. بەڵێ، خوای گەورە ئەجەلی هەموو دروست کراوێکی لەو ساتەوە کە دروستی دەکات داناوە، هەموان لەوکاتەدا دەمرن کە بۆیان دیاری کراوە. سەروەرمان حەزرەتی عومەر(خوا لێی رازی بێ) چەندەها جەنگی زۆری بینیوە و بەشداری کردووە کەچی لە کاتی پێش نوێژی کردنیدا بۆ خەڵك بە خەنجەرێك کۆتایی بەم ژینەی دنیای هات.[2] خالیدی کوڕی وەلید(خوا لێی رازی بێ) هەموو تەمەنی لە جەنگدا بەسەر بردو لە جەستەیدا شوێنی درهەمێك نەما بوو بە لێدانی شمشێر یان رم برینداز نەبووبێت، بەڵام کاتێك کە کاتی تەواو دەبێت لەسەر جێگە گیانی سپارد.[3]

من هەوڵ دەدەم ئەمە روون بکەمەوە:

ئەو ئەجەل و وادەیەی کە خوای پەروەردگار دایناوە تەنها خولەکێك پێش و پاش ناکەوێ، ئێمە لەو کاتەدا دەمرین کە خوای پەروەردگار دیاری کردووە، نابێت شتێك روو بدات بەبێ ئەمر و فەرمانی ئەو، ئەگەر مردن هات رزگار بوون نیە و، پێش کاتی هاتنیشی کەس

---

١- أسد الغابة لابن الأثير ١٣٤/٤ – ١٣٥. البداية والنهاية لابن كثير ٢٦٨/٧.

٢- الطبقات الكبرى لابن سعد ٣٦٥/٣.

٣- أنظر إلى: سير أعلام النبلاء للذهبي ٣٨٢/١.

ناتونێ بە مردن بگات ، ئەوانەی بە دوای مردندا دەگەڕان نەیانتوانیوە پێی بگەن، هەروەك ئەوانەی لە دەستی مردن هەڵدێن ڕزگاریان نابێت لێی، مادەم مردن پێش وادە وکاتی دیاری کراوی خۆی نەبێت نایەت ، کەواتە چاکتر وایە مرۆڤ بە سەربەرزی بمرێت، چونکە مردنی موسڵمان بە سەربەرزی هیچ نەبێ وەکو ژیانی خزمەت بە ئیسلام دەکات و سودی دەبێت. لەبەر ئەوەی مردنی سەربەرزانە ئەبێتە بەیداخێك و لەسەر سەری ئەوانەی لە دوای ئەو دێن ئەشەکێتەوە و پەندی لێ وەردەگرن. بەڵکو دەبێتە پەند و وانەیەك بۆ هەموو بینەر و بیسەرێك. ئێمە سەردار و گەورەمان حەزرەتی حەمزە(خوا لێی ڕازی بێ) لە بیر نەچووە و هەرگیز لە بیری ناکەین، چۆن لەبیری دەکەین کە لەبەر دەستی پێغەمبەردا ﷺ دژی دوژمن دەجەنگا، دوای ئەوەی پارچە پارچەکرا مەلائیکەت لە ئاسماندا بە خوێنەکەی نوسیان (شێری خودا). بگرە هەندێ لە خەڵکی بیر و باوەڕیان وایە و هەندێکی تریش تاقییان کردۆتەوە کە ڕۆحیانەتی حەزرەتی حەمزە(خوا لێی ڕازی بێ) – ئەگەر داوای یارمەتی لێبکرێت– دێت و کۆمەکیان دەکات لە کارەکانیاندا، ئەوانەی کە چاو کراوە و خاوەن بەصیرەتن دەتوانن هەموو کات ببینن. لە هەر شوێنێکدا کە ناوی ببرێت ئامادە دەبێت ئەمەش لە پاداشتی ئەوچاکەیەی کە خۆی کردە قوربانی ڕێگەکەی پێغەمبەر ﷺ، ئەم پلە و پایە بەرز و شەرەفە بڵندە –هەر لەوکاتەوە– دەدرێت بە

هەرکەسێك کە خۆی بکاتە قوربانی و بە سەربەرزی و ڕێزەوە بمرێت لە ڕێگەی ئەو ئیسلامە مەزنەی کەباوەڕی پیٚ هێناوە.



# بەشی شەشەم

# شەیدایانی جیهاد



## ١- گەورەو سەردارمان حەزرەتی محەممەدﷺ

بێگومان پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ گەورەترین پێغەمبەرە لە ناو گرۆی پێغەمبەراندا لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە چاکەو میهرەبانی خوا بەهرەمەند بووە، ئەو خاوەنی بەیداخی (حەمد) و سوپاسگوزاریە، ئەو تاکە دروست کراوە خوای گەورە لە گوناهی سەرەتا و کۆتای خۆش بوو بێت، واتە خوای گەورە (پاك و بێگەردی بۆ خوا) هەروەك پێش ئەوەی پەیامی پێ بسپێرێ بڕیاری داوە تووشی گوناح نەبێت ، هەروەها لە کاتی پێغەمبەرایەتیەکەیدا بواری پێنەداوە تووشی گوناح ببێت ، ئەو گەورە و سەرداری پێغەمبەرانە و خۆشەویستی خوای جیهانیانە، بەڵکو خۆشەویسترین بەدی هێنراوە لە لای پەروەردگاری و، هەموو شتێکی دراوەتێ بگرە هیچ پلە و مەرتەبەیەکی دنیا یاخود دوا ڕۆژ نەماوە نەیدرێتێ... لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەو پێغەمبەرەﷺ ئاوات و داواکاریەکی هەبووە، دەبینین لەو فەرمودەیەی بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە دەفەرموێ: (وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي

أغْزُو فِي سَبِيلِ اللهِ فَأقْتَلُ ثُمَّ أغْزُو فَأقْتَلُ ثُمَّ أغْزُو فَأقْتَلُ)[1].ئا ئەمەیە کە پێغەمبەرﷺ هەوڵی بۆ دەدات و هیوا و ئاواتی بۆ دەخوازێت: سەیرکە دەبێ فەخری عالەم چ پێویستیەکی بە شەهیدبوون هەبێ؟ چ پێویستیەك لە ئارادایە کە حەزی بە شەهادەت و دەست نوێژگرتنە بە خوێنە پاکەکەی، لە کاتێك دا تاجی (لولاك لولاك لما خلقت الافلاك)[2] ی لەسەر نراوە..

بەڵێ، ئەو حەزی دەکرد و بە دوای شەهیدبووندا دەگەڕا، چونکە شەهادەت هەموو گرێ کوێرەکان دەکاتەوە لە دادگای باڵاشدا مرۆڤ بە پلە و پایەی بەرز و ناوازە دەگەیەنێت.

با ماهیەتی ئەم پلە و مەرتەبانە هەر لە خۆی ببیستین و فێری ببین:

ئەنەسی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: کاتێك لە ڕۆژی قیامەتدا بەندەکان بۆ لێپرسینەوە دەوەستن کۆمەڵێك دێن و شمشێرەکانیان لەسەر ملیانە و لە گەردنیان خوێن دەتکێ و دەرگای بەهەشتیان قەرەباڵەخ کردووە، دەوترێ ئەمانە کێن؟ لە وەڵامدا دەوترێ شەهیدەکانن ئەوان زیندون و ڕۆزیان پێ دەدرێ.

---

١- مسلم، الإمارة، ١٠٣- ١٠٦. البخاري، الإيمان، ٢٦. النسائي، الجهاد، ١٨- ٣٠.

٢- تكلم علماء محققون حول هذا الحديث، فمنهم من أقره ومنهم من ضعفه، ولعل قول على القاري في شرح الشفا(٦/١) يعّد خلاصة جيدة، حيث يقول:"إنه صحيح معنى ولو ضعف مبنى".

کاتێك ئازیزمانﷺ دەفەرموێت: (پێم خۆش بوو کە لەڕێی خوادا بکوژرێم و پاشان زیندو بکرێمەوە...) سەرنجمان بۆ ئەم خاڵە ڕادەکێشێ، چونکە لەنێوان پێغەمبەراندا زۆرێك هەن لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر بوون کەچی لەڕێی خوادا تێکۆشاون و جلی جەنگیان پۆشیوە و بە پلەی شەهادەت ڕێزدار بوون. ئەگەر لەم ڕوانگەیەوە سەرنج بدەینە پێغەمبەرﷺ هەمووومان دەزانین کە ژنە جولەکەیەك ژەهری کردە ناو خواردنێك و لەو خواردنە ژەهراویەی خوارد، لەلای هەندێك لە مێژوو نووسان بەکاریگەری ئەو ژەهرە گیانی لەدەست داوە، ئەمەش –لەلایەکەوە– بەواتەی شەهادەت دێت، واتە پێغەمبەرﷺ بەشەهیدی وەفاتی کردووە، بەڵام ئەو دەیوست لەغەزاکاندا شەهید ببێت، خوای گەورەش بەڵێنی پێ دابوو لە خەڵك بیپارێزێت، بۆ ئەوەی ئوممەتی محەممەدﷺ پەرتەوازە نەبێت. واتە کە ئەو داوای شەهادەتی کردووە خوای گەورە بە جۆرێکی تر وەڵامی داواکەی داوەتەوە.

**٢- گەورەو سەردارمان حەزرەتی عومەر(خوا لێی ڕازی بێت).**

لەئەنجامی جیهاد و جیهاددا هەموو خاوەن ژیریەك ئاواتی شەهیدبوونە، حەزرەتی عومەریش(خوا لێی ڕازی بێت) لەو کەسانەبوو، دوای حەزرەتی ئەبوبەکر(خوا لێی ڕازی بێت) چووە سەر مینبەری ڕەسول الله بە درێژایی دە ساڵ لە ژێر چاودێری ڕۆحانیەتی پێغەمبەرداﷺ لە مزگەوتەکەیدا وتاری بۆ خەڵك دەدا ، دەڵێم لەژێر چاودێری ڕۆحانیەتی پێغەمبەرداﷺ، چونکە پێغەمبەرﷺ لە دیدی

حـــەزرەتی عومـــەردا (خـــوا لێـــی ڕازی بێـــت) نـــەمردووە، بەڵکوتـــەنها جێگۆڕکـــێی کـــردووە لـــە هۆدەیەکـــەوە بـــۆ هۆدەیـــەکی تـــر، واتـــە لـــە هۆدەکـــەی حـــەزرەتی عائیشـــە(خـــوا لێـــی ڕازی بێـــت) بـــۆ هـــۆدەی بەختەوەری و نوور لەژێر زەویدا و لە پشت ئەویشەوە جیهانی بـەرزەخ و جیهانی میسالی دەبینێ.

لـە وتارێکـدا سـەردارمان حـەزرەتی عومـەر(خـوا لێـی ڕازی بێـت) باسـی بەهەشـتی عـەدن(جنـة عـدن)ی کـرد کـە چـەند فراوانـە و چـەند دەرگای تێدایـە و، ئەوانـەی یەکـەمجار دەچـێتە نـاوی "پێغەمبـەرانن"، ڕاستەوخۆ پاش وتەکانی بە ڕوانینێکی ناسـك بـۆ گـۆڕی پێغەمبـەریﷺ ڕوانی لەبەر ڕێز و بە گەورە زانین چەمیەوە و فـەرموی: "پـیرۆزت بێـت ئەی خاوەنی قەبر" پاشان بەردەوام بوو لە باسی ئەوانـەی کـە دەچـنە نـاو بەهەشـتی عـەدن "ڕاسـتگۆکانن"، هـەروەها بـە ناسـکی لایـەکی کردەوە و بە ڕێز و شکۆوە چەمیەوە و سەیری قەبرەکـەی ئەبوبـەکری سـدیقی کـرد و فـەرموی: "پـیرۆزت بێـت ئـەی خـاوەنی قـەبر" پاشـان فەرموی ئەوانەی دەچنە بەهەشـتی عـەدن "شـەهیدەکانن" – لەوانەیـە ئەو شەهادەتەی کە پێغەمبەرﷺ مـژدەی پێـدا بـوو بـەبیری هاتبێتـەوە کاتێك پێکەوە لەسەر ئوحود لەگەڵ پێغەمبـەرداﷺ بـوون کـە فـەرموی: (أثْبُتْ أُحُدُ فَمَا عَلَيْكَ إِلاّ نَبِيٌّ أوْ صِدِّيقٌ أوْ شَهِيدَانِ)[1]، (ئـەی ئوحـد ئـارام بە پێغەمبەرێك و ڕاسـتگۆیەك و دوو شـەهیدت لەسـەرن). لەوانەیـە ئـەو

---

١- البخاري، فضائل أصحاب النبي، ٦/. أبوداود، اسنة، ٨.

ڕۆژەی وەبیرهاتبێتــەوە کــەمێك بــێدەنگ بــوو... هــەموان چــاوەڕێی لێوەکــانی حــەزرەتی عومــەر بــوون بــزانن چــی دەڵــێ لەبــەر خۆیــەوە سەرزەنشتی خۆی کرد و فەرموی: "تۆ کەی بەکەڵکی شەهادەت دێیت ئەی عومەر؟" واتە ئایا پێی دەگەیت؟، یان جۆرێك لەو قسانە. پاشـان جارێکی تـر وەسـتاو دەسـتی بـە ئاخـاوتن کـردەوە "ئـەو خوایـەی کـە هیدایەتی دای بۆئیسلام وهیجرەتی بەنسیب کردی وکردیتی بـە هـاوەڵی پێغەمبەرﷺو لە مەدینەی منەوەردا نیشتەجێی کردی هـەر ئەوخودایـە شەهادەتت بە نسیب دەکات"، ئەمە بوو خـەونی حـەزرەتی عومـەر کـە خوا شەهادەتی بە نسیب بکات، هەر ئـەویش بـوو پێغەمبـەری ئـازیزﷺ لەبارەیەوە فەرمووبووی: (لَوْ كَانَ بَعْدِي نَبِـيٌّ لَكَـانَ عُمَـرَ بْـنَ الخَطّـابِ)[١]، (ئەگەر دوای مـن پێغەمبـەر ببوایـە، عومـەری کـوڕی خـەتتاب دەبـوو)، حەزرەتی عومەر(خوا لێی ڕازی بێت) بە پلەی دووەم لـەو شـیلەی ئـەو زانستە لەدونیەی (العلم اللدنی) مژیبوو کە پێغەمبەرﷺ بە پلەی یەکـەم مژی لێدابوو و نۆشی کردبوو. حـەزرەتی عومـەر(خـوا لێـی ڕازی بێـت) نمونەی بڵندی بوو کە لە ناو ئوممەت دا هاوشانی نەبوو. لەگـەڵ هـەموو ئەمانەدا حەزی لەوە بوو بـە شـەهیدبوون تـاجی ئـەو جیهـاد و جیهـادە بهۆنێتەوە کە لە سەری کردبوو.

نازانین ماوەی نێوان ئەم وتارە و ئەو کاتەی بە خەنجەر لێـی دراو کەوتە سەر زەوی و خەڵتانی خوێن بوو، لەوکاتەدا لە نوێژدا بوو و پێش

---

١- الترمزي، المناقب،١٨. مجمع الزوائد للهيثمي ٩/٦٨.

نوێژی بۆ موسڵمانەکان دەکرد، مێژوو شتێکی ڕوون و دڵنیاکەرمان پێ نادات، لەوانەیە ئەم وتارەی حەزرەتی عومەر لە دوا ڕۆژەکانی تەمەنی دا بوبێت و، بە ئامـاژەو زمنی ئاواتی مردنی خواستبێت و حەزی لێکردبێت. لە فیراقی پێغەمبەرﷺو صدديق دا ئارامی لێبڕابوو، کە لە توانایدا نەبوو بەرگەی ئەو حاڵەتە بگرێت. بۆیە زۆر جار بە پەرۆشەوە دەیگوت (خوایە گیان شەهادەتم بە نسیب بکەیت و مردنیشم لە شارەکەی پێغەمبەرداﷺ پێ ببەخشیت)[1]. ئەم دوعایەی دەکرد و لەخوا دەلاڵایەوە و دەگریا و موسڵمانەکانیش لە دوایەوە دەگریان. خوای گەورە دوعاکەی گیرا کرد و لە یەکێك لە نوێژەکانیدا پێکراو شەهادەتی خەڵات کرا.

لەڕاستیدا ئەگەر ئێمە بایەخی ئەو دوو دڵۆپە فرمێسك و خوێنەمان بزانیبا کە لەڕێی خوادا دەڕژێت و لە شەوق و تاسەدا بۆ جیهانێکی تر لای پادشای باڵادەست بە هەزار و یەك تاسە و شەوقەوە هەوڵی گرتنی ئەو بارودۆخەمان دەداو نەماندەهێشت لە دەستمان دەرچێت و بۆ گەیشتن پێی ئەماندا لە شەقەی باڵ. بێ گومان ئەمەش پەیوەستە بە پلەی ئیمان و گوێڕایەڵی ئەو کەسەیەوە .پێغەمبەرﷺ تایبەت بەم بابەتە دەفەرموێت: (عَيْنَانِ لا تَمَسُّهُمَا النَّارُ عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ

---

١- (اللّهُمَّ ارزُقْنِي شَهَادَةً فِي سَبِيلِكَ وَاجْعَلْ مَوْتِي فِي بَلَدِ رَسُولِكَﷺ) البخاري، فضائل المدينة(الحج) ١٢، الطبقات الكبرى لابن سعد ٣٣١/٣، حلية الأولياء لأبي يعيم ٥٣/١.

خَشْـيَةِ اللهِ وَعَـيْنٌ بَاتَـتْ تَحْـرُسُ فِـي سَـبِيلِ اللهِ)[1]، ( دوو چـاو ئاگريـان بەرناكەوێت چاوێك لە ترس و خەشیەی خوادا گریا بێت و، چاوێك لەبەر خوا ئێشكی گرتبێت). بەڵێ، خوای گـەورە تـا ئـەم ئەندازەیـە ئـەم دوو دڵۆپەی خۆشی دەوێـن. ئـەوەی خۆشەویستی خـۆی پەیوەسـت بكـات بەوەی كە خودا خۆشی دەوێت و پێی ڕازیە، خۆی تەرخان دەكات بـۆ ئەم ڕێگەیە و ئارەزووی لە هیچ چێژێكی ئەم ژیانەی دنیـا نـابێ و پشـت لە چێژە ڕووكەشەكانی دەكات، لەبەردەم فریـودەرە دنیایەكانـدا خـۆی زەلیل ناكات، بەڵكو بە هەموو سۆز و لەتیفەكانیەوە خۆی ئامـادەی دوا ڕۆژ دەكات، دیـارە ئـەم كاروبارانـەش پێچـراون بـە گەیشـتنی مـرۆڤ بـە پلـەكانی عیرفانـەوە. ئەمـەش كـارێكی ئاسـان نـی یـە بـەڵكو لـە كـارە هــەرەگران و ئەسـتەمەكانە. عیرفـان لەدیـدی ئێمــەدا بریتـی یـە: لـە داگیرسانی شۆڵەی ئیمان لە ناخی مرۆڤدا هەر وەك چۆن دنیا دەبینێـت و سەیری دەكات و دەیخوێنێتەوە، بە نووری ئیمان دوارۆژیش ببێنێت و سەیری بكات و بیخوێنێتەوە، لەم كاتـەدا شـەوق و تاسـەمەندیەكی بـێ سنور لە ناخی مرۆڤدا بۆ دوارۆژ دروست دەبێت كـە هـیچ ژیرێـك فـەزڵی هیچ شتێكی تـر نـادا بەسـەر جیهـاد و جیهـاد و، شـەهیدبوون لـە ڕێی خـوادا، كەسـێك كـە جـوانی ئەبـەدی و سـەرمەدی ببینێـت، چـۆن لا دەكاتەوە بەلای ئەم دنیا فانی و گەنیوەدا ؟.

---

١- الترمزي، فضائل الجهاد، ١٢، كنز العمال للهندي٣/١٤١.

### ٣- عەمری کوڕی جەموح - سەعدی کوڕی خەیسەمە (خوا لێیان ڕازی بێت)

شەهادەت زامنی بەدەستهێنانی نەمریە، عەمری کوڕی جەموح و سەعدی کوڕی خەیسەمە لەوکەسانە بوون کە لەسەردەمی نووردا ئەم گرەنتیەیان بەدەست هێنا. ئەم دووانە لەسەر جێ کەوتبوون و نەیان دەتوانی بەبێ گۆچان بەڕێگادا بڕۆن. بەڵام هەرکە بانگی جیهاد درا یەکسەر لە جێگەکەیاندا ڕاپەڕین و وەك شێری پێکراو خۆیان ئامادەی جیهاد دەکرد.. هەریەکەیان بە کوڕو کوڕەزاکانیان گوت: ئەگەر هەر کارێکی تر بوایە فەزڵی ئێوەم دەدا بەسەر نەفسی خۆمدا و پێشم دەخستن. بەڵام ئێستا شەهادەت و گەیشتنە بە لیقای خوا(پاك و بێگەردی بۆ خوا) و بەدەستهێنانی بەهەشت و بەختەوەری نەبڕاوەیە، لەم شتەدا هیچ کەس بەرژەوەندی خۆی نادات بەکەسی تر، پێیان وت: (تۆ نەخۆشیت و لەسەر جێگە کەوتویت و تەمەنێکت بەسەر بردووە، ڕێگە بدەن با ئێمە لە بری جەنابتان بچین) ئەم گفتوگۆیە لە دوو ماڵی جیاوازدا و بە جیا لە نێوان دوو کەسدا ڕویداوە، بەڵام خەریکە یەك مانای هەبێت، هەرچەندە هیچ کامیان ئاگاداری ئەوی تریان نەبووە، بۆ دادوەری چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺ، هەردوو پیرە پیاو شکاتیان لە دوو گەنجەکان کرد و هەریەکە لە دوو کاتی جیادا وتیان: (منداڵ و نەوەکانم ناهێڵن شەهادەتم بەنسیب بێت، یان ڕۆحم بکەمە قوربانی ڕێگەکەت) هەرچەندە پێغەمبەرﷺ ویستی هێوریان بکاتەوە، بەڵام

ئەوان چاویان بڕیبوە بەهەشت و پێغەمبەرﷺ لە کۆتاییدا ناچار بوو کە بفەرموێت: بەڵێ. بەم جۆرە هەردوو پیرە پیاو لە جیهاددا بەشدار بوون، پاشان پێغەمبەرﷺ چاوی پیرۆزی بڕییە جیهانی بەرز و بڵند و فەرمووی: (کە عەمری کوڕی جەموح دەبینم قاچەکەی چاك بووەتەوە و لەبەهەشتدا ڕادەکات). بینیان هەردووکیان پشتاو پشت پاڵیان بەیەکەوە دابوو و لەگۆڕەپانی جەنگداکەوتبوون.[1] بەڵێ سەعدی کوڕی خەیسەمە و عەمری کوڕی جەموح لە پێناوی خوادا شەهید بوون، شاهیدیش لەسەر ئەمە خوای باڵادەست و سەرداری پێغەمبەرانﷺ و فریشتە بەڕێزەکان بوون، هەموویان شاهیدن لەسەر ئەوەی کە ئەم دوانە بەهەشتیان مسۆگەر کرد.

خەڵکانی تریش دەتوانن هەر لەم دنیایەدا بە هەمان حەز و تاسەوە بژین ، بەجۆرێك بژین کە مردن و شەهیدبوون بەرزترین مەبەست و ئامانجیان بێت، بەڵام هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد ئەم کارە پەیوەستە بە عیرفان و شوێن کەوتنی ئەوانەوە کە لەم ڕێیەدا پیشەنگ و خاوەن ئەزمونن، گریانی ئێرە لەوێ دەبێتە پێکەنین و خۆشی، دڵەڕاوکێ و تەنگ و چەڵەمەکانی ئێرە دەگۆڕێن بۆ تام و چێژ لەوێ، گیرۆدەبوون و دەردەسەری و نەهامەتی دەبێتە رزگاربوون و ئاسوودەیی و خۆش نوودی ، پێویستە مرۆڤ بەچاکی هەست بەمە بکات

---

١- مجمع الزوائد للهيثمي ٣١/٩. أسد الغابة لابن الأثير ٢٠٨/٤. المسند للإمام أحمد ٢٩٩/٥.

و هەمیشە و هەردەم ئەم ڕاستیانە بە خۆی بڵێتەوە، هەر لەبەر ئەمەیە کە گەڕان بە ڕووداوەکانی ڕابردوماندا سودی زۆری دەبێت، ئەم بانگەوازە پیرۆزەی ئیسلاممان هەر لە نەوەی یەکەمەوە هەتاکو ئێستاش بەم هەست و سۆزەوە بۆ هاتووە و، لەسەر ئەم ڕەوتە پێمان گەیشتووە، بەڵێ قوربانیدان بە نەفس لە لای ئەوان حەز و ئاوات و عیشق و تاسە بوو، لەگەڵ ئەوەی ئەوانیش مرۆڤ بوون و ژیانیان خۆش دەویست، بەڵام ئەوەی ئەوانی گەیاندە ئەم ڕێیە حەقیقەتێکی ترە، ناشتوانرێت ئەم حەقیقەتە ڕوون بکرێتەوە مەگەر کاتێ کە زانیمان و دڵنیابووین ئەوان بە پلەی عیرفان گەیشتون.

قورئانی پیرۆزیش ئەم عیرفانەمان تێدا دەچێنێ و ڕایدەگەیەنێت کە کەس ناگاتە پلە و پایەی موجاهیدان مەگەر ئەو کەسەی وەك ئەوان بکات و لە جیهادکردندا بیانکاتە پێشەنگ، ئەوان قەت نەمردوون بەڵکو زیندون و لای خودای خۆیانن بە جۆرە ژیانێك دەژین کە ئێمە لێی تێناگەین، کەسێکیش پێی نەگات لێی تێناگات...

## ٤- جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب (خوا لێی ڕازی بێت)

شەهادەت بەڵگەی عیززەت و سەربەرزی ئیماندارە، "شەهید"یش لەڕۆژی دواییدا ئەوەندە سەربەرزە و ڕێزی لێدەنرێت کە وەك میوانێکی سەربەرز و ڕێزدار تەماشا دەکرێت، ئەوەی جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب بینی یەکێکە لەو نموونە و وێنانە. جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب(خوا لێی ڕازی بێت) لە جەنگی موئتەدا وەك پاڵەوانێکی بێ وێنە دەجەنگا،

بەڕادەیەك ئەوانەی چاودێریان دەكرد دەڵێن تەنها یەكجاریش ئاوڕی بۆ دواوە نەداوەتەوە، كاتێكیش ئەسپەكەی بووەتە ڕێگر لە زۆرانبازی و چوونە پێشەوەدا، دەست بەجێ لەسەر ئەسپەكەی دابەزیوە و بە شمشێر دەست و قاچی ئەسپەكەی بڕی و بە پێی خۆی چووە ناوجەرگەی جەنگەوە و بە سنگێكی فراوان و ناخێكی دلێرەوە ڕووبەڕووی مردن بوویەوە، لە ئاكامدا قۆڵەكانی لەدەست داو شەهید بوو.[1] پێغەمبەرﷺ لە كۆڕێكدا كە عبداللەی كوڕی جەعفەری تیابوو بۆ دڵدانەوەی فەرمووی: (رَأَيْتُ جَعْفَراً يَطِيرُ فِي الجَنَّةِ مَعَ المَلَائِكَةِ)[2].

بەڵێ جەعفەر ناز و نیعمەتی فڕینی لەگەڵ مەلائیكەتەكاندا بە دەست هێنا، بەرگی مرۆڤێتی داماڵی و وەك مەلائیكەتی لێهات.

## ٥- ئەبو عەقیل (خوا لێی ڕازی بێت)

ئەبو عەقیل (خوا لێی ڕازی بێت) خۆی تەنها داستانێك بوو، بەشداری بەدری كردووە ، دوای ئەوە لە هەموو غەزاكاندا لەگەڵ پێغەمبەرﷺ بەشداری كردووە، بەڵام نەدەگەیشتە ئەوشتەی كە هەمیشە بە دواییدا دەگەڕا و بۆی بە پەرۆش بوو. ئەوەی بۆی دەگەڕا دەستی نەدەكەوت تا لە جەنگی یەمامەدا پێی گەیشت، كە جەنگێكی سەخت بوو لەگەڵ موسیەلەمەی درۆزندا، یەمامە كۆتا ڕۆژی ئەو بوو لە دنیادا... لەڕاستیدا ئەم كۆتا ڕۆژەی شایانی ئەوەیە پێی بوترێت

---

١- انظر إلى: أبوداود، الجهاد ٥٩. أسد الغابة لابن كثير ٢/٢٤٣.

٢- الترمزي، المناقب، ٢٩. الواقدي، المغازي، ٢/٧٦٧.

ڕۆژی هەتاهـەتایی. بێگومـان لـەو ڕۆژەدا ئەبوعـەقیل بـە خوێنەکـەی هۆنراوەیەکی وای نوسی کە هیچ کەس لـە شـاعیرەکان بـۆی نـەدەوترا.
ئێستە با گوێ لە ئیبن عومـەر(خـوا لێـی ڕازی بێـت) بگـرین ڕووداوەکـە بگێڕێتەوە:

لە ڕۆژی یەمامەدا خەڵکی ریزیان بەست بـۆ جـەنگ، یەکـەم کـەس کە بریندار بوو ئەبوعەقیلی ئەنیفی بوو (خوا لێی ڕازی بێت) تیرێك لێـی دا کە نێوان هەردوو شـانی و دڵـی گرتبـوو، شـوێنەکەی جێـی مەترسـی نەبوو، دەسبەجێ تیرەکەیان دەرهێنا، لەمـەوە هێشـتا هـەر سـەرەتای ڕۆژ بوو شانی چەپی بێ هێز بوو ، بردیان بۆ لای کەلوپـەل و بارگەکـە، کاتێك کـە جـەنگ گـەرم بـوو و موسـڵمانەکان شـکان و کەلوپەلـەکانیان جێهێشت، ئەبوعەقیلیش لە تاو برینەکەی بێهێز بوو بوو، کـە گـوێی لـە مەعنی کوڕی عەدی(خوا لێی ڕازی بێت) بـوو هـاواری لـە ئەنصـار کـرد "الله الله هێـرش بەرنـەوە بـۆ سـەر دوژمنەکـەتان" مـەعن خـۆی پێشـی خەڵکەکە کەوتبوو، ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە ئەنصـار هاواریـان کـرد " فریامـان کـەون، فریامـان کـەون " تـاك تـاك هـاتن، عەبـدڵلەی کـوڕی عومەر(خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: ئەبوعەقیل هۆزەکەی هەڵسـاند، وتم: ئەبوعەقیل چـی دەکـەی تـۆ نـاتوانی بجـەنگی ، وتـی: بانگکـەرێك بانگی کـردم، ئـیبن عومـەر دەڵـێ وتم: ئـەو بـانگ لـە کۆمـەڵی ئەنصـار دەکات، مەبەستی بریندارەکان نییە، ئەبوعەقیل وتـی: مـن پیـاوێکم لـە ئەنصـار و هەرچـی بـێ بەدەمیـەوە دەچـم ، ئـیبن عومـەر دەڵـێ:

ئەبوعــەقیل خــۆی ئامــادە کــرد و بــە تــەنها شمشـێرەکەی بەدەسـتی ڕاستیەوە گرت و پاشان هاواری کـرد "ئـەی کۆمـەڵی ئەنصـار هێرشـێك وەك هێرشـەکەی حونـەین" هـەموو کـۆ بوونـەوە " ڕەحمـەتی خـوا لـە هەموویان " پـێش موسـوڵمانەکان کـەوتن و بـەرەو ڕووی دوژمنەکـەیان چوون، تادوژمنیان کردەوە بـە نـاو باخچـەکەدا و لەوێـدا تێکهەڵپـژان ، لەنێوان ئێمەو ئەواندا شمشێرەکان دەچـوون بـەناو یەکدا ئـیبن عومـەر دەڵێ: سەیری ئەبوعەقیلم کرد دەستە بریندارەکەی لە شاندا پەڕی بوو و کەوتبووە سەر زەوی و، چواردە برینی پێوە بوو کـە هـەر هـەموویان سەخت وکوژەر بوون، موسەیلەمەی دوژمنی خواش کوژرا، ئیبن عومـەر دەڵێ: لەلای ئەبوعەقیل وەسـتام لـەکۆتا هەناسـەکانیدا بـوو، پـێم وت: ئەبوعەقیل. بە زەحمەت وتی: بەڵێ، سەرکەتن بەشی کێیە، وتم: مـژدە بێ "دەنگم هـەڵبڕی"دوژمنــی خـوا کـوژرا، پەنجـەی بـەرز کـردەوە بـۆ ئاسمــان وگیــانی سـپارد (ڕەحمــەتی خــوای لێ بێــت). دوای ئــەوەی گەڕاینــەوە هــەموویم بـۆ حــەزرەتی عومــەر (خــوا لێــی ڕازی بێــت) گێڕایـەوە، فـەرموی ئـەو هەمیشـە بـەدوای شـەهیدیدا دەگـەڕا و بـۆی عەودالّ بوو.

## ٦- عبدالله ی کوڕی عەمر(خوا لێی ڕازی بێت)

عبدالله باوکی جابیرە، جـابیر (خـوا لێـی ڕازی بێـت)هاتـە خزمـەت پێغەمبەرﷺو وتی: باوکم وەفاتی کردووە و دوای خۆی منـداڵێکی زۆری لێ بەجێ ماوە، دەبێ من بیانگرمە ئەستۆ و ئەوەندەشم نیە کە بیانبـەم

بەڕێوە، پێغەمبەرﷺ بۆ دڵنەوایی هات بۆ ماڵەکەی، کچەکەی جابیر یان خوشکەکەی بەدەنگێکی زۆر خەمبار لە هۆدەیەکی تردا دەگریا پێغەمبەرﷺ دەیبیست ،[1] (جابیری کوڕی عبدالله دەڵێت: کاتێك عبدالله ی کوڕی عەمری کوڕی حەرام لە ڕۆژی ئوحوددا شەهید بوو پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەی جابیر ئایا هەواڵت نەدەمێ کەخوای گەورە چی بە باوکت فەرموو؟ وتم: بەڵێ، فەرموی: خوای گەورە لەگەڵ هیچ کەسێکدا بە بێ پەردە فەرمایشتی نەکردوە لەگەڵ باوکت نەبێ، بێ پەردە و ڕوبەڕوو پێی فەرموو: ئەی بەندەکەم داوام لێبکە بابتدەمێ، وتی: خوای پەروەردگار زیندوم بکەرەوە با جارێکی تر لەپێناوی تۆدا بکوژرێم، خوای گەورە فەرموی بڕیارم داوە کە کەس ناگەڕێنمەوە بۆ دنیا، وتی: دەی خوای پەروەردگار ئەم هەواڵە بگەیەنە بەوانەی دوای خۆم، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نازڵ کرد: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩، (ئەوانەی

---

١- (جابِرَ بْنَ عَبْدِاللهِ يَقُولُ: لَمَّا قُتِلَ عَبْدُاللهِ بْنُ عَمْرِو بْنِ حَرَامٍ يَوْمَ أُحُدٍ قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ يَا جَابِرُ الا أُخْبِرُكَ مَا قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لأَبِيكَ؟ قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: مَا كَلَّمَ اللهُ أَحَداً إِلاَّ مِنْ وَرَاءِ حِجَابٍ وَكَلَّمَ أَبَاكَ كِفَاحاً فَقَالَ: يَا عَبْدِي تَمَنَّ عَلَيَّ أُعْطِكَ قَالَ: يَا رَبِّ تُحْيِينِي فَأُقْتَلُ فِيكَ ثَانِيَةً. قَالَ: إِنَّهُ سَبَقَ مِنِّي أَنَّهُمْ إِلَيْهَا لا يُرْجَعُونَ. قَالَ: يَا رَبِّ فَأَبْلِغْ مَنْ وَرَائِي فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ هَذِهِ الآيَةَ ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩، ابن ماجه، الجهاد، ١٦. الترمذي، التفسير، ١٨/٣. دلائل النبوة للبيهقي ٢٩٨/٣. اسد الغابة لابن الأثير ٣٤/٣.

لەرێی خوادا کوژراون هەرگیز وامەزانن مردوون، نەخێر. ئەوانە زیندون و لای خودا رۆزیان دەدرێتی)

## ٧- حەرامی کوڕی مەلحان(خوا لێی ڕازی بێت)

ئایا کەسێك هەیە کە پاڵەوانیەتی "بیری مەعونە" نەزانێ ؟ پێغەمبەرﷺ چەند هاوەڵێکی نارد کە شارەزای قورئان بوون بۆ رێنمایی و بانگکردنی هۆزی عەمری کوڕی توفەیل ، لەنێوانیاندا حەڕامی کوڕی مەلحانیان تێدا بوو، کە خاڵی سەردارمان ئەنەس و برای ئوم سولەیم بوو، یەکێك بوو لەوانەی تاڕادەی شەیدایی عاشقی پێغەمبەرﷺ بوو، کاتێك لە هۆزەکە نزیك بوونەوە و قسەی کرد لەگەڵ ئەوانەی کە لەگەڵی بوون وتی: من دەڕۆم بۆ ئەوێ ئێوە خۆتان حەشاربدەن ئەگەر گوێیان بۆگرتم ئێوەش بە دوای مندا وەرن، خۆ ئەگەر توشی شتێك بووم ئێوە ڕزگار دەبن. ئەوانی تریش بەمە ڕازی بوون.

بەم شێوەیە گەیشتە هۆزەکەی عەمری کوڕی توفەیل، وایان پیشاندا کە گوێیان گرتوە، کاتێك حەقی بۆ رونکردنەوە و راستیەکانی راڤە کرد، ئەوانیش بەڕم هەنجن هەنجنیان کردو لە سەر زەوی فڕێیاندا و لە خوێنی خۆیدا گەوزاندیان، ئەویش بەنووری ئەو ئایەتە گەیشت کە لە دوا ڕۆژدا هەموو کەسێك پێی دەگات: ﴿ فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ ق: ٢٢. لەوکاتەدا کە کوشتیان وتی: (اللهُ أكْبَـرُ فُـزْتُ وَرَبِّ الكَعْبَة)( الله أکبر بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم)، کافرەکان هەربە کوشتنی ئەم نەوەستان بەڵکو هەموو ئەوانەشیان کوشتن کە لەگەڵیدا

بــوون لـــه ئه‌صـــحابه بـــه‌ڕێزه‌كان، له‌وكاتـــه‌دا پێغه‌مبـــه‌رﷺلـــه‌ناو ئه‌صحابه‌كاندا له‌ مزگه‌وتدا بوو ده‌ستی به‌ گریان كرد:

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ نَاسٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا أَنِ ابْعَثْ مَعَنَا رِجَالاً يُعَلِّمُونَا الْقُرْآنَ وَالسُّنَّةَ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ سَبْعِينَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُمُ الْقُرَّاءُ فِيهِمْ خَالِي حَرَامٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَدَارَسُونَ بِاللَّيْلِ يَتَعَلَّمُونَ وَكَانُوا بِالنَّهَارِ يَجِيئُونَ بِالْمَاءِ فَيَضَعُونَهُ فِي الْمَسْجِدِ وَيَحْتَطِبُونَ فَيَبِيعُونَهُ وَيَشْتَرُونَ بِهِ الطَّعَامَ لأَهْلِ الصُّفَّةِ وَلِلْفُقَرَاءِ فَبَعَثَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ إِلَيْهِمْ فَعَرَضُوا لَهُمْ فَقَتَلُوهُمْ قَبْلَ أَنْ يَبْلُغُوا الْمَكَانَ فَقَالُوا: اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا قَالَ وَأَتَى رَجُلٌ حَرَاماً خَالَ أَنَسٍ مِنْ خَلْفِهِ بِرُمْحٍ حَتَّى أَنْفَذَهُ فَقَالَ حَرَامٌ: فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ. فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ لأَصْحَابِهِ إِخْوَانَكُمْ قَدْ قُتِلُوا وَإِنَّهُمْ قَالُوا اللَّهُمَّ بَلِّغْ عَنَّا نَبِيَّنَا أَنَّا قَدْ لَقِينَاكَ فَرَضِينَا عَنْكَ وَرَضِيتَ عَنَّا)[1]، (ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك ده‌فه‌رموێ:هه‌ندێ خه‌ڵك هاتنه‌ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌رﷺ وتیان چه‌ند پیاوێكمان له‌گه‌ڵ بنێره‌ تا قورئـان و سوننه‌تمان فێر بكه‌ن ، پێغه‌مبه‌ریشﷺ حه‌فتا پیاوی ئه‌نساری بۆ ناردن كه‌ پێیان ده‌وترا خوێنه‌ره‌كان خاڵه‌"حه‌رام" م یه‌كێك بوو له‌وانه‌، به‌شه‌و قورئانیان ده‌خوێند و دیراسه‌یان ده‌كرد و فێرده‌بوون، به‌ڕۆژدا ئاویان ده‌هێنا بۆ مزگه‌وت و،داریان ده‌هێناو ده‌یانفرۆشت و به‌ پاره‌كه‌ی خواردنیان بۆ ئه‌هلی صوففه‌ و هه‌ژاره‌كان ده‌كڕی، پێش ئه‌وه‌ی بگه‌نه‌ ئه‌و جێیه‌ هاتنه‌ ڕێیان وكوشتنیان،

---

١- المسند للإمام أحمد ٣/٢٧٠. الطبقات الكبرى لابن سعد ٣/٥١٤.

ئەوانیش وتیان: خوایە هەواڵمان بدە بە پێغەمبەرەکەمانﷺکە ئێمە بەتۆ گەیشتووین و لەتۆ رازین و تۆش لێمان رازی بووی، وتی پیاوێك هات بۆ "حەرام"ی خاڵی ئەنەس و لەپشتەوە رمێکی لێدا و لەو دیوەوە دەرچوو، حەرام وتی: الله أكبر بە پەروەردگاری کابە سەرکەوتم. پێغەمبەرﷺبە هاوەڵانی فەرموو براکانتان کوژران و وتیان : خوایە هەواڵمان بدە بە پێغەمبەرەکەمانﷺکە ئێمە بەتۆ گەیشتووین ولەتۆ رازین و تۆش لێمان رازی بووی).

دوای ئەم ڕووداوە تا ماوەیەك پێغەمبەرﷺدەستی کرد بە خوێندنی دوعای قنوت، هەموو ڕۆژێك دوعای لەو پیاوکوژانە دەکرد هەتا ئایەتی: ﴿ لَيْسَ لَكَ مِنَ ٱلْأَمْرِ شَىْءٌ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ أَوْ يُعَذِّبَهُمْ فَإِنَّهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ ﴾ آل عمران: ١٢٨. واتە بڕیاری سزادانی ئەوانە تایبەتە بەخوا خۆیەوە، هەر خودا خۆی لە ناوتانا شەهیدەکان هەڵدەبژێرێت و سەربەرز و ڕێزداریان دەکات و کافرانیش بە سزای هەتا هەتایی لە ئاگری دۆزەخدا ڕیسوا دەکات، خوای گەورە مۆڵەت دەدات بەڵام دەست بەردار نابێت، ئەوەتا مۆڵەت بەکافر دەدات بەڵام ئەگەر گرتی دەربازبوونی نیە، خوا پشتی چەندین دەسەڵاتداری شکاندو چەند زۆردار و ستەمکاری بە توندی گرتووە و تۆڵەی توانادارو دەستەڵاتداری لێ سەندن و، چەند فیرعەون هەبوون کۆشکەکەیانی ڕماند بەسەریاندا.. چەندینی تری نوقمی دەریا کرد یان لە ئاسمانەوە بەردبارانی کردن و، چەندی تریشی لەژێر ئاگردا جێ هێشت –وەك بومبی– تا ببنە پەند بۆ دوای خۆیان،

خوای گەورە مۆڵەت دەدات بەڵام دەست بەردار نابێت، خوای گەورە حەلیم و لەسەرخۆیە، بەڵام سزاکەی پڕ ئێش و ئازارە.

ئەوانەی کە بوونە هۆی ڕژاندنی خوێنی موسڵمانان لە بیری مەعونەدا هەموویان بوونە سوتەمەنی دۆزەخ جگەلەوانەیان کە موسڵمان بوون، بەڵام ئەوانەی شەهید بوون لە بەهەشتانێکی پڕ نازو نیعمەتدان، ئەگەر ئەمە سەربەرزی و ڕێز لێنان نەبێ ئەی کامەیە؟!

### ٨- سەردارمان حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (خوا لێی ڕازی بێت)

ئایا دەگونجێت کاتێك باسی شەهید دەکرێت سەرداری شەهیدان و شێری خوا حەزرەتی حەمزە باس نەکرێت؟ کاتێك حەزرەتی حەمزە چووە ناو جەنگی ئوحود، بەو جۆرە شەهید بوو کە شایانی ئەو بێت ، ئەو پاڵەوانی و ئازایەتیەی حەزرەتی حەمزە دەستی کەوتووە هیچ شەهید و موجاهیدێك دەستی نەکەوتوە. هەروەك مێژوو نوسان باسیان کردوە لەو ڕۆژەدا سی و سێ کافری کوشت، پاشان شەهید بوو ، کەواتە نزیکەی نیوەی کوژراوانی موشریکینی کوشتوە پێش ئەوەی کە جەستەی لەت لەت بکرێت، صەفیەی خوشکی بەسەر تەرمەکەیدا دەگریا و لەهەمان کاتدا هەوڵی دەدا کە پارچەکانی لاشەی کۆ بکاتەوە، لە لایەك شەهادەتی حەمزە و لەلایەکی تریش گریانی– دایکی زوبەیر– پوری پێغەمبەر "صەفیە" پێغەمبەریﷺهێنابوویە جۆش ، لەو ڕۆژەدا کەسێك نەبوو لە موسڵمانەکان بریندار نەبووبێت، سەرباری شەست و نۆ

شـەهید، کاتێـك کـە گەڕانـەوە بـۆ مەدینـە هەرکەسـەو بـۆ خزمـەکانی دەگریا، گریان بۆ شەهیدەکان و گریـان بـۆ برینـدارەکان، گریـانیش بـۆ ئەوانەی بە کاریگەری برینەکەیانەوە لەماڵەوە وەفاتیان کرد، بەڵام لـەم گریان و شینەدا کەسێك لە بیر کرابوو فرمێسکی بـۆ نـە دەڕێـژرا، بـەڵێ ئـەوە گـەورە و سـەرداری شـەهیدەکان بـوو، ئـەم دیمەنـە زۆر ئـازاری پێغەمبەریﷺ دا، بۆیـە بـەدڵێکی شـکاوی خـەمبارەوە فـەرموی: (لَكِنَّ حَمْزَةَ لا بَوَاكِيَ لَهُ)[1] (کەس شیوەن بۆ حـەمزە ناکـات)، کاتێـك سـەعدی کوڕی مەعاز (خوا لێی ڕازی بێـت) ئـەم فەرمایشـتەی بیسـت لەبـەردەم دەرگای ماڵی حەمزەدا ژنانی ئەنصاری کـۆکردەوە و پـێی وتـن بگـرین بـۆ حـەمزە پاشـان بـۆ مردوەکانتـان، ئەمـە هـەتا ماوەیـەك بـوو بـووە نەریتێك و پەیڕە و دەکرا، پاشـان نـەما، خـۆ ئەگـەر موسـڵمانان هـەتا ڕۆژی قیامەت بۆ حەمزە بگرین، پاشان بۆ مردوەکانیان هێشـتا نـاتوانن مافی حەمزەی پاڵەوانی خوا بدەن.

---

١- ابن ماجه، الجنائز،٥٣. المسند للإمام أحمد ٢/٤٠.

٩- عبدالله ی کوڕی جەحش(خوا لێی ڕازی بێت)

هەروەها عبداللەی کوڕی جەحشیش لە عاشقانی شەهادەت بوو، لە ڕۆژی ئوحوددا، عبداللەی کوڕی جەحش و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (خوا لێی ڕازی بێت) خاڵۆزای یەکتر بوون، بە یەکتر گەیشتن سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێ: عبداللەی کوڕی جەحش لە جەنگی ئوحوددا وتی: بۆ نایەیت داوا لەخوا بکەین، چوینە کەنارێکەوە و دوعامان کرد، من داوام کردو وتم: خوای پەروەردگار ئەگەر سبەی ڕوو بەڕووی دوژمن بومەوە بە پیاوێکم بگەیەنیت کە زۆر جەربەزە و ئازا بێت لە پێناوی تۆدا بیکوژم و کەل و پەلەکانی بکەونە بەردەستم، عبدالله ئامینی کرد، پاشان عبداللەی کوڕی جەحش وتی: (خوای پەروەردگار سبەی بە پیاوێکم بگەیەنیت زۆر جەربەزە و ئازا بێت لەگەڵیدا جەنگ بکەم لەبەرخاتری تۆ لێی بدەم و لێم بدات پاشان بمکوژێ و بمبات و گوێ و لوتم ببڕێت، کاتێک گەیشتمە حزورت لێم بپرسی: ئەی عبدالله بۆ گوێ و لوتت بڕاوە؟ منیش دەڵێم لە پێناو تۆو پێغەمبەرەکەتدا، تۆیش بڵێیت ڕاستت کرد) سەعد دەڵێت: دوعاکەی عبدلله لەوەی من چاکتر بوو لە کۆتایی ئەو ڕۆژەدا بینیم گوێ و لوتی کرابوون بە پەتێکدا.[1]

---

١- انظر إلى: أسد الغابة لابن الأثير ١٩٥/٣. مجمع الزوائد للهيثمي ٣٠١/٩.

## ئەنجام

ئیمانداری ڕاستەقینە... فەزڵی مردنێکی شەریف و سەربەرزانە دەدات بەسەر ژیانی زەلیلی و ڕیسواییدا.. مردنی سەربەرزی هەزار جار لە ژیانێك چاکترە کە لە ماڵەکەی خۆتدا بژیت بەڵام لە دڵە ڕاوکێ و دوودڵیدا بیت و لە ژێرچەپۆکی ستەمکاران دا. ئەمە کاتێك دەبێ ئەگەر ئەم موسڵمانە سەربەرز و ڕێز لێگیراوە نوقم بووبێت لە دەریای عیرفانی پەروەردگاردا . خۆ ئەوکەسەی هاوشێوەی ژیانی گۆڕستان بژی ئەوە هەر لە ژیاندا مردووە و لەم مانایە تێناگات.

لە ڕاستیدا زۆر ئەستەمە کە بەشێوەیەکی تر لە تاوانەکانمان پاکببینەوە ، مرۆڤ جارێك دەژی بۆ ئەوەی بەختەوەری هەمیشەیی لە دواڕۆژدا بەدەستبهێنێت. بەم جۆرە ژیانمان نوقمی تاوانە و دەڕوات . گەنجێك چەندجار لە بازەڕەکاندا تێدەپەڕێت ڕوانینی حەرام ئەنجام دەدات و لە شەقامەکاندا دێت و دەچێت، هەموو ڕۆژێك چەند جار دەمرێت.. چەندجار نوقمی شتە قیزەونەکان دەبێت، چەندجار نوقمی زەلکاو دەبێت، چەندێك حەرام دادەبەزێتە ناو گەدەی، بگرە ڕۆژی چەند جار لەبەردەم حەرام و خراپەدا چۆك دەدات و شکست دەخوات، چەندجار سەرپێچی خودا دەکات و ڕێزلێگرتنی پێغەمبەری خۆشەویست پشت گوێ دەخات، بەڵکو بە دژایەتی کردنی لەگەڵ قورئانی پیرۆزدا چەندین جار بۆ ناو کوفرو بێ باوەڕی دەخلیسکێت.. جگە لە ڕێگەی شەهادەت هیچ هۆکار و شتێك نیە گەرەنتی و زەمانەت

بێت بۆ پاك بوونەوەی ئەم جەستانە کە پڕبوون لە گوناهو تاوان...
مانەوە بە بیر و هەستی شەهیدیەوە و، لەدەست نەدانی هەموو دەرفەتێکی رەخساو و، هەوڵ و جیهاد بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن بۆ ئەو پێگە بەرزو بڵندە، بە نەسرەوتنێکی وەك نەسرەوتنەکەی ئەبو عەقیل دەبێت... بەڵێ ئەمە بڵندترین ئامانجی هەر کەسێکە کە سپاردەی بانگەوازی ئیسلامی مەزنی گرتبێتە ئەستۆ و پێویستە لەمەش لانەدات. شەهیدی ئامانج و خواست و عەشقی ئێمەیە. باشترین شتێك بۆ ئەو کەسەی ژیانی بەکرداری چاك و باش بەسەر بردبێت ئەوەیە کە کردەوەکانی بەو دێڕەشیعرە ناسکەی هۆنیویەتەوە بە سەروا و قافیەی شەهادەت کۆتایی پێ بێنێت. ئەوکاتە ژیان بەهایەکی گەورەتر و سەنگینتری دەبێت، هەتا خوا ویستی لەسەربێت لە باخچەکانی بەهەشتدا وەك گوڵێك دەپشکوێ و، بەڕووی ئەو گەنجینە موبارەکانەدا دەکرێتەوە، ئایا لە بەهەشتدا لەسەر هەموو کردارێکی جوان و چاك پاداشت وەرناگرێ. بەهەشت و دۆزەخ دوو حەوز و دوو گەنجینەن کردەوەکانی ئادەمیزادیان تێدا کۆدەکرێنەوە، ئەوەی چاك و پاکە لە بەهەشتدا و ئەوەی بەدو وخراپە لەدۆزەخدا، لەم سۆنگەیەوە ئێمە وەك کەسێك واین کە بەهەشت و دۆزەخ بچنێت و، تاڵ تاڵ بیانهۆنێتەوە.

بێگومان شەهادەت تاجی کردەوە چاکەکانە ، شەهیدی بۆ کەسێك کە ژیانی نەزر کردبێت بۆ خوا بریتی یە لە سپاردنەوەی ئەو

ڕۆحەی کە خوا پێی بەخشیوە بە بەرچاو ڕوونیەوە بۆ خوا ، چونکە ئەو هێشتا لەم دنیادایە لەوانەیە چاوی بکرێتەوە و ئەودیو دنیای پێ ببینێ، لەبەر ئەوەی شەهید ژیانی خۆی نەزرکردوە بۆ خوا هەر لە دنیادا بەروبومی بەهەشت دەچنێت، لەم ڕوانگەیەوە بەخت یاوەری دەبێ و لە ناو خەڵکیدا هەڵبژێرراوە.

هەر کەس دەیەوێت بەشێکی باش و تەواو لە ژیانێکی موبارەك و خاوێن بەدەست بێنێت، پێویستە لەسەری لەپێناو خوادا چەند دڵۆپە خوێنێك بەسەر ئەو ژیانەیدا بڕێژێت و ببێتە شەهید بۆ ئەوەی بە چاکترین شێوە بە ئامانجەکەی بگات. ئەو ژیانەش کۆتایەکەی بەشەهیدی نەیەت با بە کرداری جوان و چاکیش ئاوەدان بێت، وەلێ چەندین بۆشایی بەجێدێڵێت. بەڵام ئەو ژیانەی شێوەیەك لە شێوەکانی شەهیدی بەدەست هێنابێت، نە بۆشایی تێدایە و نە کەلەبەر، ئەو ژیانە وەك هۆنراوەیەك وایە کە سەروای دوایین دێری تەواوکرابێت، پێکەوەگونجان و ڕێك و پێکی و خۆشەویستی لێ دەچۆڕێ. شەهادەت کلیلێکی خاوەن نهێنی مەزنە، دەرگاکانی ڕەحمەت و بەزەیی ئاسمانەکان و زەوی دەخاتە سەرپشت. بگرە لەو شوێنانەشدا کە پێغەمبەران لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت شەهید بەبێ لێپرسینەوە بەرەو ئەو جیهانانە دەڕوات کە بۆی ئامادە کراوە ، شەهید حەصانەی هەیە، ئەو جل وبەرگەی کە بەخوێنەکەی سوور بووە لەو ڕێوڕەسمەدا ئەو ئیمتیازەی پێدەدات.

له هەموو جەنگە یەکلاکەرەوەکان و هەوڵ و تەقەلا پڕوکێنەر و جموجۆڵ و جیهادە قارەمانانەکاندا کە هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەخۆ، هەموو کەسێکی ئیماندار سوورە لە سەر ئەوەی لە کۆتایی ژیانیدا پلەی شەهادەت بەدەستبێنێ. چونکە خوای بالآدەست لەو جۆرە بەندانەی ڕازی دەبێت، هەروەك لە فەرمودەی پیرۆزی پێغەمبەرداﷺ هاتووە: (عَنْ عَبْدُاللهِ بْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهﷺ عَجِبَ رَبُّنَا عَزَ وَجَلَّ مِنْ رَجُلٍ غَزَا فِي سَبْيلِ اللهِ فَانْهَزَمَ يَعْنِي أصْحَابَهُ فَعَلِمَ مَا عَلَيْهِ فَرَجَعَ أُهَرِيقَ دَمُهُ فَيَقُولُ اللهُ تَعَالَى لِمَلائكَتِهِ انْظُرُوا إلَى عَبْدِي رَجَعَ رَغْبَةً فِيمَا عِنْدِي وَشَفَقَةً مِمَّا عِنْدِي حَتَّى أُهَرِيقَ دَمُهُ)[1].

عبداللەی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: پەروەردگارمان بە پیاوێك سەرسام بوو کە غەزای کرد لە پێناوی خوادا، هاوەڵەکانی پشتیان هەڵکرد و ڕایانکرد، ئەو زانی ئەرکی سەر شانی چی یە ، جەنگی کرد تا خوێنی ڕژا، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێت: سەیری بەندەکەم بکەن حەزی لەوە کرد کە لە لای منە –بەهەشت و ڕەزامەندی خوا–و، ترسیشی لەوەیە کە لە لای منە –دۆزەخ و سزای خوا– تا خوێنی ڕژا).

---

١– أبو داود، الجیهاد، ٣٨.

# کتێبە چاپکراوەکانی دانەر بە زمانی شیرینی کوردی

| | |
|---|---|
| ١- قەدەر لە روانگەی قورئان و سوننەتەوە. | م. فاروق رسول يحى ٢٠٠١ |
| ٢- ئیرشاد و تەبلیغ | م. حبيب محمد سعيد ٢٠٠٩ |
| ٣- چەند تیشکێکی قورئانی لە ئاسمانی ویژداندا | م. حبيب محمد سعيد ٢٠٠٩ |
| ٤- راستی بەدیهێنان و تیۆری پەرەسەندن | حسن حمه كريم |
| ٥- تەرازوەکان یان روناکیەکانی سەر رێگە | حسن حمه كريم ٢٠١٠ |
| ٦- نوری نەمر (لە حەوت بەش پێکهاتووە) | حسن حمه كريم ٢٠١١ |
| ٧- ئەم کتێبەی بەردەستت | |

# ئەو کتێبانەی دانەر کە ئامادەی چاپن

| | |
|---|---|
| تەپۆڵکە زمرووتیەکان | حسن حمه كريم |
| چریکەی رۆح و ئێش و رێشی دڵ | رەئوف مەعروف |

# پێڕست